ڕۆڤار، بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە
هەر ژمارەی تایبەتە بەداهێنەرێکی کورد
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم
دوو مانگ جارێك دەریدەکات

سەرنووسەر
ڕەووف بێگەرد

بەڕێوەبەری نووسین
ئیدریس عەلی

گرافیك دیزاین
ئارام عەلی

تیراژ: ١٢٠٠

نرخ: ١٢٥٠

ناونیشان
سلێمانی- شاڕێی سالم
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

www.serdem.net

پەیوەندیکردن بەرۆڤارەوە لەڕێگەی
ئیمێڵی
edrisali16@yahoo.com

چاپخانەی
دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

## ژمارەکانی ڕابردووی ڕۆڤار

ئیبراهیم ئەحمەد، محەممەد مەولود (مـەم)، کەمال مەزهەر، لەتیف حامید، سوارە ئیلخانی زادە، محێدین زەنگەنە، ئەحمەد هـەردی، یەڵماز گۆنای، ئیسماعیل بێشکچی، موحەرەم موحەممەد ئەمین، دڵدار، مەستورەی ئەردەڵانی، مەولانا خالیدی نەقشبەندی، جەمال عیرفان، مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، جەلالی میرزا کەریم، ڕەفیق چالاك، عەبدولخالق مەعروف، هێمن، حسێن حوزنی موکریانی، ئەمین فەیزی، کامەران موکری، جەلال تەقی، حەمە ساڵح دیلان، هەژار، شاکر فەتاح، کاکەی فەلاح، عەلائەدین سەجادی، شێخ محەممەدی خاڵ، حسێن عارف، عەلی ئەشرەفی دەروێشیان، سەلیم بەرەکات، پێشەوا قازی محەممەد، مەحمود مەلا عیزەت، فایەق بێکەس، عەبدوڵا پەشێو، جگەرخوێن، بابەتاهیری عوریان، عەرەب شەمۆ، دڵشاد مەریوانی، مەنسوری یاقوتی، حەسەنی قزڵجی، برایم ئەمین باڵدار، مەسعود محەممەد، بەختیار زێوەر، نەجمەدینی مەلا، مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی، لەتیف هەڵمەت، حاجی قادری کۆیی، پیرەمێردی نەمر، مەلا مەحمودی بایەزیدی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شەریف پاشای خەندان، جەمیل صائیب، ئەحمەد موختار جاف، عەبدولڕەحیم ڕەحیمی هەکاری، میر شەرەف خانی بەدلیسی، وەفایی، گۆران، بەدیع باباجان، جەمال شارباژێڕی، مارف بەرزنجی، نالی، مەحموی، ئەنوەر قەرەداخی، حەمەی مەلا کەریم، سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی، ئیبراهیم یونسی، قەرەنی جەمیل، مەلای گەورەی کۆیە، تۆفیق وەهبی بەگ، محەممەد ئەمین زەکی، عەبدوڵڵا جەوهەر، مستەفا بەگی کوردی، شێرکۆ بێکەس، سالم، عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ، ئەحمەد کایا، مەولەوی،قانیع.عوسمان چێوار.کەریم کابان. ڕەفیق حیلمی.

سەرۆکی فەخری
شێرکۆ بێکەس

سەرۆکی دەزگا
ئازاد بەرزنجی

# پێڕست



بەڕێز فاروق مەلامستەفا سپۆنسەری ئەم ژمارەییەی کردووە

ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار تایبەتە بە یەکێک لە زانا ناودارەکانی کورد کە لەسەر ئاستی وڵاتانی دراوسێ و ڕۆژهەڵات ناسراوە و خاوەنی پێگە و ڕۆڵ و کاریگەری خۆیەتی، ئەویش (پڕۆفیسۆر دکتۆر مستەفا زەڵمی)ە.
ئەم زانا ناودارە ژیانێکی پڕ بەرهەم و چالاکی هەبووە و خاوەنی دەیان کتێبە کە بوونەتە سەرچاوەی زانستیی بۆ سەدان لیکۆڵینەوە و بڕوانامەی ماستەر و دکتۆرا، نەک هەر لە زانکۆکانی کوردستان و عێراق، بەڵکو لە زۆربەی زانکۆ بەناوبانگەکانی وڵاتانی عەرەبییش، کتێبە مەنهەجییەکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی کە بۆ خوێندکارانی کۆلێژەکانی یاسا لە زانکۆکانی عێراق دایناون، لە چەندین کتێبی تایبەت پێکهاتوون سەبارەت بە بەرپرسیارێتی جینائیی و حوکمەکانی میراتگریی و وەسیەت و فەلسەفەی شەریعەت و ڕێگەکانی هەڵێنجانی حوکمەکان و دەروازەیەک بۆ خویندنی شەریعەت.
دکتۆر زەڵمی، بە لێکۆڵینەوە بەرفراوان و وردەکانی، سودێکی گەورەی بە یاساناسان گەیاندووە، چونکە پێشتر زۆربەی یاساناسان زمان و مەنتیق و زانستی کەلام و فەلسەفە و فیقهو ئسولْیان نەخوێندبوو، نەگەیشتبوونە ئەو پلە و مەقامەی کە مامۆستا زەڵمی پێی گەیشتبوو، لەو بەراوردە وردانەی کردوونی لەنێوان شەریعەت و یاسا، یاخود لێکۆڵینەوەی یاسا لەبەرڕۆشنایی مەنتیق و زانستی کەلام.
ئەم ڕۆڤارەمان بە حەق و شایستەی ئەم زانا گەورەیەی کورد زانی، چونکە ناوبراو جگە لە خەرمانی پڕ لەبەرەکەتی کتێب و توێژینەوە زانستییەکانی، هاوکات لە کاروانی پڕ لە چالاکیی خۆیدا، لەسەر ئاستی ناوخۆی عێراق و ولاتانی عەرەبیی، تێڕوانینەکانی وەک بەرنامە دەخوێنرێت و لەلایەن زانکۆ گەورەکانەوە خەلاتی ڕێزلێنانی پێ دراوە لەپای ئەو خزمەتە فکریی و مەعریفییەی پێشکەشی کردووە.
زەڵمی، شانازی بەوەوە دەکات کە کوردە و هەندێک لە کارەکانیشی، هەر بە کوردی نووسیون.
دەخوازین لەم ژمارەیەدا توانیبێتمان لە ئاست گەورەیی ئەم زاتەدا بین و خزمەتیکمان بە دنیا فراوانەکەی کردبێت.

**بەڕێوەبەری نووسین**

# دەستکەوتە زانستییەکانی دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی و هەڵسەنگاندنی توێژینەوە و کتێبەکانی

**د. موحسین عەبدولحەمید**

**وەرگێڕانی بۆ کوردی: جومعە سدیق**

دکتۆر مستەفا ئیبراهیم ئەمین زەڵمی، مامۆستای شارەزا (ئوستاز موتەمەرس)، خزمەتی زانکۆیی زیاتر لە چارەکە سەدەیەکی هەیە، لەو ماوەیەدا لە نێوان کۆلێژەکانی یاسا لە زانکۆکانی عێراق جێگۆڕکێی کردووە. بەر لەوە، لە وەزارەتی بەرگری خزمەتێکی زۆری کردووە، مۆڵەتی زانستیی لە قوتابخانە ئایینییەکان وەرگرتووە، پاشان خوێندنەکەی لە زانکۆکانی بەغداد و قاهیرە و ئەزهەر تەواو کردووە و چەندین بڕوانامەی باڵای لە شەریعە و یاسادا بە دەست هێناوە، لە ماوەی خزمەتی زانکۆییشیدا جێگەی ڕێزی ئەو زانکۆیانە بووە کە کاری تێدا کردوون، سەرەڕای ڕێزلێنانی لە لایەن ناوەند و دامەزراوەی زانستی و مەدەنی لە ناوخۆ و دەرەوەی عێراق.

## چالاكیە زانستییەكانی

چالاكی زانستیی دكتۆر گەیشتووەتە سەرپەرشتیكردنی نامە زانستییەكان و بەشداریكردنی بەردەوام لە گفتوگۆی ئەو نامانە لە بواری یاسا و شەریعەت و مێژوودا، لەگەڵ بەشداریكردن لە كۆنگرە زانستییەكان و هەندێك كۆنگرەی دەرەوە، سەرەڕای ئەو لیژنانەی بۆ گفتوگۆی یاساكان و كێشەكانی شەریعەت لە وەزارەتی داد و خوێندنی باڵا پێك دەهێنران.

دكتۆر زەڵمی لە ڕێگەی توێژینەوە ڕەسەنەكانیەوە بۆ پلەی (ئوستازیەت) بەرز بووەتەوە، من یەكێك بووم لە بڕیاردەرانی بەرزكردنەوەی بۆ ئوستازیەت، ئەوسا بە ڕەسەنایەتیی توێژینەوەكانی سەرسام بووم.

## كۆششە زانستییەكانی

بەرهەمەكانی دكتۆر زەڵمی زۆر بەرفراوانن، كە ئامادەكردنیان پێویستی بە ساڵانێكی دوورودرێژ و كۆششی چڕوپڕ هەبووە، ئەمە لە وردیی توێژینەوەكەی و گەڕانەوەی بۆ سەدان سەرچاوەی ڕەسەنی كۆن و نوێ بەدی دەكرێت، بەبێ ئەوەی بە زۆر گواستنەوەی دەقەكان بێزارت بكات، بەڵكو داڕشتنی خۆی بەسەریاندا زاڵە، ئەمەش بەوەی لە زانستەكانی زمانی عەرەبی و زانستییە عەقڵییەكان لە مەنتیق و زانستی گفتوگۆ (منازەرە) و زانستە شەرعییەكان و زانستە یاساییەكاندا، بە شێوەیەكی زانستیی باڵا كاریان لەسەر بكات.

دەتوانین بەرهەمە زانستییەكانی لە سێ گرووپدا كۆ بكەینەوە:

١- گرووپی یەكەم: كتێبە مەنهەجییەكانی كە بۆ قوتابیانی كۆلێژەكانی یاسا لە زانكۆكانی عێراق دایناون. ئەوانەش چەند كتێبێكی تایبەتن بە بەرپرسیارێتیی جینائی، حوكمەكانی میراتگری، وەسیەت، فەلسەفەی شەریعەت، ڕێگەكانی هەڵێنجانی حوكمەكان و دەروازەیەك بۆ خوێندنی شەریعەت، هەموو ئەوانە بە هاوتاكردن و بەراوردكردنی لەگەڵ یاسا دانراوەكان، بەتایبەتی عێراقییەكان، ئەو كتێبانە لەژێر ڕۆشنایی بنەچە زانستییەكانی دانانی كتێب دانراون.

٢- گرووپی دووەم: ئەو كتێبانەن كە لەبارەی لایەنە هەمەچەشنەكانی شەریعەت دانراون لەگەڵ هاوتاكردن و بەراوردكردنی بە یاساكان، ئەوانەش تایبەتن بە كێشەكانی تەڵاق و هۆكارەكانی جیاوازیی فەقیهەكان و بابەتی نەسخ لە قورئان و پەیوەندیی نێوان زانستی مەنتیق و یاسا و حیكمەتی حوكمەكانی قورئان و پابەندییەكان و ڕێگرییەكانی بەرپرسیارێتی لە شەریعەت و یاسا و كێشەكانی تاوان و ڕێكخستنی كۆمەڵ و مافەكانی مرۆڤ و بابەتی دیكەی گرنگ.

٣- گرووپی سێیەم: ئەو توێژینەوە شەرعی و یاساییانەی لە گۆڤارە زانستییەكاندا بڵاوی كردوونەتەوە یان لە كۆنگرە هەمەجۆرەكاندا پێشكەشی كردوون.

هەڵسەنگاندنی پەیڕەوەكەی و ئاڕاستەی پەرەسەندنی دانانەكانی

ئەگەر كتێبەكانی دانەر لە لایەك دابنێین و بەپێی مێژووی دانانەكەی ڕێكیان بخەین، دەبینین هەردەم بەرەو باشتر پەرەیان سەندووە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر بەدواداچوونی زانستیی بەردەوام و خۆشەویستیی بۆ بابەتەكەی، ئەوەشە هۆی داهێنانەكانی، سەرەڕای بنەما زانستییە پتەوەكەی لە زانستەكانی زمان و مەنتیق و فەلسەفە و شەریعەت، كە زۆر یارمەتیی داوە لە تێگەیشتنی دەقە یاساییە چڕكراوە پوختەكان و كێشەكانیان و لێكدانەوەكانیان.

دكتۆر زەڵمی بە لێكۆڵینەوە بەرفراوانە وردەكانی سوودێكی گەورەی بە یاساناسان گەیاندووە، چونكە زۆربەی یاساناسان، لەبەر ئەوەی زمان و مەنتیق و زانستی گفتوگۆ و فەلسەفە و فیقە و ئوصوڵیان نەخوێندووە، نەیانتوانیوە بگەنە

ئەوەی کە مامۆستای دانەر پێی گەیشتووە، لەو بەراوردە وردانەی کە لە نێوان شەریعەت و یاسا یان لێکۆڵینەوەی یاسا لەبەر ڕۆشنایی مەنتیق و زانستی گفتوگۆ (منازەرە) کردوویەتی. بێگومان وانەوتنەوەی بەردەوام و بێپچڕانی مامۆستا زەڵمی لە چەند کۆلێژێکی یاسا هاوکاری بووە بۆ ڕۆشنکردنەوەی مێشکی قوتابیانی بەو چەمکە دروستانەی یان ئاڕاستەکردنی قوتابییەکانی لە خوێندنە باڵاکان یان لە گفتوگۆی نامەکاندا. لە گفتوگۆی هەندێک لەو نامانەدا خۆم لەگەڵیدا بەشدار بووم، یان وەک شارەزا یان گوێگر ئامادەی بووم، ڕاستەوخۆ هەموو ئەوانەم بۆ دەرکەوتووە.

دکتۆر زەڵمی لە سەرجەم نووسین و دانراوەکانیدا سەرقاڵی کێشەیەکی گرنگە، ئەویش گێڕانەوەی پەیوەندیی نێوان شەریعەت و یاسا، کە تەنها لەم سەردەمە تازەیەدا لێک دابڕاون، کاتێک شەرعناسان دەستبەرداری لێکۆڵینەوەی یاسا بوون و یاساناسان دەستبەرداری لێکۆڵینەوەی شەریعەت بوون. ئەم حاڵەتەش دابڕانێکی لێکەوتەوە و بە زیانی ئوممەت لە بواری یاسادانان کۆتایی هات. بۆیە کتێبەکانی دکتۆر زەڵمی ئەگەر لە وڵاتە عەرەبی و ئیسلامییەکان بڵاو ببێتەوە، دەبێتە هۆی شۆڕشێکی تازەی یاسادانان بە سوودوەرگرتن لە شەریعەتی ئیسلامی لە نووسینەوەی یاسادا لە هەموو ڕوویەکەوە.

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

دکتۆر زەڵمی لە کتێبەکانیدا تەنها ڕای فەقیهەکان ناهێنێتەوە، بەڵکو بەڵگەکانیشیان دەخاتە ڕوو و بەراوردیان دەکات، ئەوەی سەرنج لە کتێبەکانی بدات، دەبینێت کە دەمارگیریی بۆ ڕایەک یان مەزهەبێک نییە، بەڵکو شوێن ئەوە دەکەوێت کە لە میانەی بەڵگەکان و بەهێزییان بۆی دەردەکەوێت کە هەقە.

عەقڵیەتی زەڵمی عەقڵیەتێکی سەردەمانەیە، ئەو هەوڵ دەدات سوود لەو ڕایە نەرمانەی فەقیهەکان ببینێت، کە بەڵگەی بەهێز پشتیوانیی دەکەن، بۆ دۆزینەوەی چارەسەری ڕەوان بۆ گرفتەکانی ئەم سەردەمە و هەڵگرتنی زەحمەتی لەسەر موسوڵمانان، لەمەشدا شوێن بنەمانی ئاسانکاری کەوتووە کە شەریعەتی ئیسلامیی پێ ناسراوە، بەتایبەتی لە سەردەمی هاوەڵە بەڕێزەکان.

پاشان دکتۆر زەڵمی لە سەردەمەکەی خۆیدا دەژی، بەو مانایەی لە فتوا و بەڕاستتردانانە (ترجیح) فیقهییەکانیدا داهێنانە زانستییە تازەکان بەکار دەهێنێت.

دکتۆر لە میانەی بەراوردکارییەکانی لە نێوان شەریعەت و یاسا، دەگات بەوەی کە هیچی دەست نەکەوتووە بیسەلمێنێت کە شەریعەتی ئیسلامی لەگەڵ زانست و فیترەتی ئادەمیزاد و واقیعدا دژیەک بن، هەروەها هیچ ڕایەکی دروستی لە یاسادا نەبینیوە، کە پێشتر فەقیهەکان پێی نەگەیشتبن.

لە کاتی بەراوردکردنی نێوان ڕایەکاندا، دکتۆر پابەندی چوار مەزهەبەکە نابێت، بەڵکو بۆ مەزهەبەکانی شیعەی دوانزە ئیمامی و زەیدی و ئەبازی و زاهری و فەرموودەناسان تێدەپەڕێت. ئەو ڕێبازە بەهایەکی بەرز بە نووسین و توێژینەوەکانی دەدات و بە لێزانییەوە بەرەو ئیجتیهادی هاوسەردەمانەی دەبات.

دکتۆر لە سەرجەم کتێبەکانیدا داهێنانی کردووە کتێب و توێژینەوەکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی هەر هەموویان بەسوودن، لێرەولەوێ داهێنانی زۆر و ڕای تازە و دروستی تێدایە، بەڵام من وای دەبینم کە داهێنانەکەی لەم کتێبانەیدا زیاتر لەوانی دیکە دەرکەوتووە، کە ئەمانەن:

١- موانع المسؤولية الجنائية في الشريعة الإسلامية والتشريعات الجزائية العربية:

کتێبێکی زۆر گرنگە، تێیدا موفرەداتی وردی بەرپرسیارێتیی جینائی ڕوون کردووەتەوە و لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامی بەراوردی کردووە. توێژەر لەوەدا پشتی بە سەرچاوە ڕەسەنەکان بەستووە، کۆن و تازە، لەژێر ڕۆشنایی چوار مەزهەبەکە و ئەوانی دیکەشدا، جا نووسەر ئەنجامی گرنگی بە دەست دەکەوێت، کەلێن لە یاسای جینائیی وڵاتە عەرەبیەکان دەدۆزێتەوە و دەری دەخات کە فەقیهەکانی مەزهەبە ئیسلامییەکان چارەسەریان کردووە و ڕای خۆیان لەبارەوە دەربڕیوە. دەکرێت بەوە سوود بە یاسا دەستکردەکان بگەیەنرێت. توێژەر بابەتەکەی لەسەر کۆمەڵێک بنەما بینا کردووە و لە بەراوردکردندا پشتی پێ بەستووە، تا یاساکان دژ نەبن بە بنەما شەرعییە قەتعییەکان. سەرەرای زۆریی را و ئیجتیهادە فیقهییەکان لە فەرهەنگە دوورودرێژەکانیدا، پێویستی بە دووبارە نووسینەوە و داڕشتنەوە هەیە بە شێوازی تازەی نووسینەوەی یاسا.

دانەر کتێبەکەی بە چەند وەڵامێکی گرنگی چەند پرسیارێکی جینائی پزیشکی کۆتایی پێ دەهێنێت، کە سەندیکای پزیشکان لە موسڵ ئاراستەیان کردووە لە بواری کارە پزیشکییەکان و نەشتەرگەری، دانەریش وەک نەریتی خۆی، لە ڕێگەی زانستە وردەکەی لە بنەچەکانی شەریعەت و یاسا، ئەو بابەتانەی چارەسەر کردووە.

٢- التبيان لرفع غموض النسخ في القرآن:

ئەم کتێبە لە بابەتەکەیدا بەگشتی تازە نییە، چونکە کۆمەڵێک لە زانایان لە سەدەکانی ڕابوردوو و ئەو سەردەمەدا نکۆڵییان لە نەسخ لە قورئانی پیرۆزدا کردووە، بەڵام تازەیی ئەم کتێبە لەوەدایە، خوێندنەوەی بۆ چەندین ئایەت کردووە، کە زۆر لە لێکدەرەوان وتویانە نەسخ کراوەتەوە، لە ڕێگەی زانستی زمان و مەنتیق و ئوسوڵ و تەفسیر و فیقە، سەلماندوویەتی کە نەسخ لە قورئاندا نییە، هەر ئایەتێک لە چوارچێوەی خۆیدا بەکار دێت، لێرەوە و لەم ڕووەوە ئەم کتێبە داهێنانێکی تێدایە، ئاماژەیە بۆ ئەو سامانە زانستییەی دانەرە بەرێزەکەی هەیەتی، کە بەبێ ئەوە نەیدەتوانی بچێتە نێو ئەو لێکۆڵینەوە وردەوە.

٣- اصول الفقه في نسيجه الجديد:

کتێبێک لە دوو بەشدا کە دانەر تیایدا لێکۆڵینەوەی بۆ زانستی ئوسوڵی فیقە بە هەموو بابەتەکانیەوە کردووە، مەزهەبێکی بە تەنها باس نەکردووە، بەڵکو بەراوردی نێوان زۆر مەزهەبی کردووە، لە بەڕاستدانان و هەڵبژاردندا تەنها شوێن ئەو بەڵگەیە کەوتووە، کە قەناعەتی پێی هەیە، بەڵکو تێپەڕیوە بەرەو ڕەخنەگرتنی خودی لە هەندێک داڕشتنی ئەو زانستە، زۆر لە نموونە کۆنەکانی بە نموونەی تازە و وەرگیراو و ڕوون گۆڕیوە.

مستەفا ئیبراهیم زەڵمی

کارێکی داهێنانەرانەی دیکەشی کردووە، ئەویش پیادەکردنی زانستی ئوسوڵی فیقهی ئیسلامی لەسەر یاسا دەستکردەکان، لەو پیادەکردنە سوودێکی گەورە بە یاساناسان گەیشت، لەوەی یارمەتییان دەدات لە دەوڵەمەندکردنی زانستی بنەماکانی یاسا بە بنەمای ورد لە زانستی ئوسوڵی فیقە.

٤- الإلتزامات في الشريعة الإسلامية والتشريعات المدنية العربية:
ئەو کتێبە لە پایەدارترینی کتێبەکانە، ماددەیەکی زانستیی تێدایە، دانەر تیایدا بەراورد لە نێوان پابەندییەکان لە شەریعەت و یاسادا دەکات و دەگات بەوەی کە پابەندییەکان لە شەریعەتی ئیسلامیدا بۆ سەرجەم چینەکانی بزووتنەوەی مرۆڤایەتی گشتگیرن. کەچی لە یاسادا تەنها پابەندیی داراییە و بەس. دانەر بۆی دەردەکەوێت کە زاراوەی پابەندی (التزام) لە کتێبە فیقهییە ئیسلامییەکاندا لەژێر زاراوەی (التكليف والمكلف) چارەسەر کراوە، ئەوەش ئەوەیە کە گەورە یاساناسانی هاوتای دکتۆر عبدالرزاق السنهوری و هیی دیکە تێبینییان نەکردووە. ئەو لێکۆڵینەوە قووڵ و وردە قووڵیی لێکۆڵینەوەی دانەر دەسەلمێنێت لە شەریعەت و یاسادا پێکەوە. ئەو کتێبە بۆشاییەکی لە کتێبخانەی یاسایی پڕ کردووەتەوە، چونکە بەپێی زانیاریی من هیچ کتێبێک نییە بەو ئاستە بابەتەکانی گشتگیر بێت، دانەرەکەی ئەو بابەتەی چارەسەر کردبێت، بۆچوونی یاساناسانی ڕاست کردووەتەوە، ئەوانەی لەبەر نەشارەزاییان لە وردەکاریی وردی شەریعەت، وا گومانیان برد کە یاسا لەو بابەتەدا لە شەریعەت گشتگیرترە، لە کاتێکدا دکتۆر زەڵمی پێچەوانەی ئەو بۆچوونەی سەلماندووە.

بەڵام هەردوو کتێبی (المنطق القانوني- قسم التصورات) و (الصلة بين المنطق والقانون) دوو کتێبی داهێنانن، چونکە یەکەم جارە زانستی مەنتیق لەسەر دەقە یاساییەکان پیادە دەکرێت، ئەوەش لە چوارچێوەی زانستی یاسادا ڕووی نەداوە، ئەوەی یارمەتیی دانەری داوە بۆ ئەو پیادەکردنە زانستییە مەزنە، شارەزاییە قووڵەکەیەتی لە زانستی مەنتیق، کە کتێبە ناسراوەکانی مەنتیقی لای گەورە زانایان لە قوتابخانە ئایینییەکاندا خوێندووە.

پوختەی قسان، دکتۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی زانایاکی پایەدارە، بەرهەمە زانستییەکانی زۆر زۆرن، لە شەریعەت و یاسادا پێکەوە قووڵ بووەتەوە، لێکۆڵینەوە و بەراوردەکانی پایەیەکی گەورەی دەبێت لە نێوەندە یاساییەکاندا. ئەو بابەتانەی چارەسەری کردوون، پەیوەندیی زۆریان هەیە بە پەرەسەندنی ڕۆشنبیریی کۆمەڵگەوە و ڕاستکردنەوەی ئاڕاستە هەڵەکان لە دانانە یاساییەکاندا، بەو بنەما و بیردۆزانەی شەریعەتی ئیسلامیی بەپێز.

# دکتۆر مستەفا زەڵمی، لە سەرچاوەی ئاوی زەڵمەوە بۆ سەرچاوەی زانستی ئەزهەر

**عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد ئەحمەدئاوایی**
shexnami@yahoo. com

پوختەیەک لە بیۆگرافیای پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا زەڵمی

**یەکەم: ناو، ڕەچەڵەک و نازناوی:**

ناوی تەواوی ئەم زانایە، مستەفای کوڕی ئیبراهیمی کوڕی صۆفی حەمەمینی کوڕی جوانمێری کوڕی ڕەجەب ئاغای کوڕی یەحیا ئاغایە، کە لە بنچینەدا دانیشتووی گوندی (بلبەر) بوون لە ناوچەی هەورامانی کوردستانی ئێران. دایکی ناوی (ڕێحان)ە، کچی حەمەسەلیم، لە نەوەی (موسا بەگ)، لە هۆزی (بەگزادە)، کە دانیشتووی ناحیەی (خورماڵ) بوون لە ناوچەی هەورامانی کوردستانی عێراق. هۆکاری بەکارهێنانی نازناوی (زەڵمی) ئەوەیە کە بنەماڵەی ئەم زانا مەزنە نزیکەی دووسەد ساڵ پێش ئێستا هاتوونەتە گوندی (زەڵم)، لە بناری هەورامانی کوردستانی عێراق و لەوێ گیرساونەتەوە، بۆیە ئەو نازناوەی بۆ خۆی بەکار هێناوە.

**دووەم: لەدایکبوون و گەورەبوونی:**

دکتۆر مستەفا زەڵمی لە ساڵی (1924) لە گوندی (زەڵم)، لە بناری هەورامانی کوردستانی عێراق لە دایک بووە و لە بنەماڵەیەکی ئایینیدا پەروەردە بووە. سەرەتای دەستکردنی بە خوێندن هەر لە گوندەکەیان لە لای (میرزا فەتحوڵڵا لهۆنی) بووە لە ساڵی (1934). پاشان ڕووی کردووەتە شارۆچکەی خورماڵ و لە حوجرەی مزگەوتی گەورە و دێرینی ئەو شارۆچکەیە لە خزمەت زانای مەزن مامۆستا مەلا سەیید عارفی چۆڕی گیرساوەتەوە، کە خزمی باوکی بووە و لەوێ دەستی کردووە بە خوێندنی کتێبە سەرەتاییەکانی ئەو سەردەمەی حوجرە، وەک (گوڵستان) و پەڕتووکە گچکەکانی ڕێزمانی عەرەبی، پاشان لەگەڵ مەلا مەحمودی سەرگەتیی هاوڕێدا ڕووی لە شاری سلێمانی کردووە و لە حوجرەی مزگەوتی (حاجی حان) دامەزراوە.

پاشان ئەم زانا مەزنە، کەوتووەتە گەڕان بە شوێن دەستخستنی زانستدا و لە ماوەی خوێندنیدا نزیکەی (16) مەدرەسە و حوجرەی ئایینی گەڕاوە، بەم ڕیزبەندییەی لای خوارەوە:

١- گوندی زەڵم.
٢- شارۆچکەی خورماڵ.
٣- گوندی دەرەشیشی سەروو.
٤- شاری سلێمانی.
٥- گوندی عەبابەیلێ.
٦- خانەقای بیارە.
٧- خانەقای تەوێڵە.
٨- شاری پاوە.
٩- گوندی دەگاگا.
١٠- گوندی شوێ.
١١- گوندی دیبۆکرێ.
١٢- گوندی کانی سپیکە -لە ناوچەی شنۆ و لاجان- ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
١٣- گوندی بالک.
١٤- شاری سنە.
١٥- گوندی گەلاڵە
١٦- شاری کۆیە.

تا دواجار لە شاری کۆیە جێگیر بووە و لە لای مامۆستا مەلا نوری جەلیزادە، برای مەلای گەورەی کۆیە، لە ساڵی (1946) ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە. شانبەشانی ئەم ئیجازەیە، بڕوانامەی جیهانیی زانستە ئیسلامییەکانیشی هەر لە هەمان ساڵدا، لە بەڕێوەبەرایەتیی ئەوقافی گشتی وەرگرتووە. پاشان بۆ خزمەتکردن بە ئایین و گەلەکەی وەک پێشنوێژ و وتارخوێن گەڕاوەتەوە گوندی (زەڵم)، دواتر بە هەمان پیشە چووەتە گوندی (سەرسییان) لە ناوچەی ڕانیە، دواتر گواستویەتیەوە بۆ مزگەوتی (بت تەبەق) لە شاری سلێمانی، تا دواجار لە مێژووی (١٠/٨/1955)، چووەتە بواری خزمەتی سەربازی و وەک پێشنوێژ و سەرپەرشتیاری ئایینی لە سوپای شاهەنشاهیی عێراقدا جێگیر بووە و بە پلەی ئەفسەر دامەزراوە. شایەنی باسە ئەو فەوجەی کە دکتۆر زەڵمی تیایدا دامەزراوە، فەوجی (سێ) بووە، سەر بە لیوای (نۆزدە)، کە بەرپرسی فەوجەکە (عەبدولسەلام عارف)ی سەرۆککۆماری پێشووی عێراق بووە، هەروەها و لە هەمان کاتدا بەرپرسی لیواکە (عەبدولکەریم قاسم) بووە، کە ئەویش لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی پاشایەتی لە عێراق بوو بە سەرۆککۆمار. سەرجەمی خزمەتی دکتۆر زەڵمی لە سوپادا (17) ساڵ و (22) ڕۆژ بووە. شانبەشانی کارەکەی هەوڵی بە دەستهێنانی بڕوانامە ئەکادیمییە فەرمییەکانی داوە و لە ساڵی (1952) بەشداریی تاقیکردنەوەی سەرەتایی کردووە و بڕوانامەی پۆلی شەشەمی سەرەتایی بە دەست هێناوە، پاشان بەشداریی تاقیکردنەوەی ناوەندی کردووە، بڕوانامەی پۆلی

سێیەمی ناوەندیی لە شاری خانەقین بە دەست هێناوە، پاشان بەشداریی تاقیکردنەوەی ئامادەیی کردووە، بڕوانامەی پۆلی چوارەمی ئامادەیی لە شاری دیالە بە دەست هێناوە، تا دواجار لە مێژووی (1960/٩/١٥) پەیوەندیی کردووە بە کۆلێژی یاسای زانکۆی بەغدا، دواتر ساڵی (1965) بڕوانامەی بەکالۆریۆسی لە یاسادا لە هەمان زانکۆ بە دەست هێناوە، ساڵی (1968) بڕوانامەی ماستەری لە شەریعەتی ئیسلامیدا، هەر لە زانکۆی بەغدا، بە دەست هێناوە کە ناونیشانی ماستەرنامەکەی (مدى سلطان الارادة في الطلاق في الشرائع والقوانين والأعراف خلال أربعة آلاف سنة) بووە، (الشيخ عبدالرحيم كشك) سەرپەرشتیاری بووە، لە ساڵی (1971) بڕوانامەی ماستەری لە فیقهی بەراوردکاری نێوان شەریعەت و یاسادا، لە زانکۆی ئەزهەر بە دەست هێناوە، لە ساڵی (1973) بڕوانامەی ماستەری لە یاسادا، لە زانکۆی ئەزهەر وەرگرتووە، تا دواجار لە مێژووی (1975/٩/٩)، بڕوانامەی دکتۆرای لە فیقهی بەراوردکاری نێوان شەریعەتی ئیسلامی و یاسادا لە زانکۆی ئەزهەر بە پلەیەکی بەرز بە دەست هێناوە، کە ناونیشانی تێزەکەی **(أسباب أختِلاف الفُقَهاء فِي الأحكامِ الشرعيّة)**، بووە، پاشان ساڵی (1976) گەڕاوەتەوە بۆ عێراق، لە ساڵی (2005) یشدا، دکتۆرای لە یاسادا لە کۆلێژی یاسای زانکۆی (بەغدا) بە پلەی (نایاب) بە دەست هێناوە، تا ساڵی (2007)، کە خانەنشین کراوە، لە زانکۆکانی وڵاتدا وانەی گوتووەتەوە.

### سێیەم: بنەماڵەکەی، هاوسەرگیریکردنی و منداڵەکانی:

شایەنی باسە کە (مەلا برایم)ی، باوکی دکتۆر مستەفا زەڵمی خوێندەوارییەکی مامناوەندیی هەبووە. لە ڕیزبەندی خوێندنی جاراندا تا پەڕتووکی (ئیزهار-اظهار)، (شەرحی مەلا جامی)ی خوێندووە، بەڵام بە هۆی ئەو گرانی و قاتوقڕییەی کە بە هۆی شەڕی جیهانیی یەکەم، لە ساڵی (1914)دا داکەوتووە، وازی لە خوێندن هێناوە، دەستی کردووە بە کارکردن بۆ بەدەستهێنانی بژێویی خۆی و خانەوادەکەی، پاشان سەبارەت بە دکتۆر مستەفا زەڵمی، ئەو لە تەمەنی (22)ساڵیدا، دوای تەواوکردنی خوێندنی ئایینی لەو سەردەمەدا لە مێژووی (1946/٧/٢٥)، لەگەڵ ئامۆزای خۆی (مەعصومە عەبدولقادر) زەماوەندی کردووە، کە ئەم کوڕ و کچانە بەرهەمی حەفتا ساڵ ژیانی پێکەوەیی ئەم دوو هاوسەرەیە:

١- (موحەممەد)، لەدایکبووی ساڵی (1948)، دەرچووی کۆلێژی ئەندازیاری، خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرا، لە (بەڕێوەبردنی کار)، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

٢- (مەسعود)، لەدایکبووی ساڵی (1951)، دەرچووی کۆلێژی ماف، زانکۆی سەلاحەددین.

٣-(فەوزیە)، لەدایکبووی ساڵی (1953)، دەرچووی

پەیمانگای هونەری ماڵی، زانکۆی بەغدا.
٤- (ئەسعەد)، لەدایکبووی ساڵی (1955)، دەرچووی کۆلێژی یاسا، زانکۆی بەغدا.
٥- (عەبدولناسر)، کە ناسراوە بە (شاهۆ)، لەدایکبووی ساڵی (1957)، ماستەر لە هونەری سینەمایی، ئێستایش خوێندکاری دکتۆرایە لە هەمان پسپۆڕیی خۆی، لە زانکۆی بەغدا، هەروەها مامۆستای هونەرە جوانەکانە لە زانکۆی سەلاحەددین.
٦- (د. گەلاوێژ)، لەدایکبووی ساڵی (1958)، خاوەنی دکتۆرایە لە یاسادا، مامۆستایە لە کۆلێژی یاسای زانکۆی سەلاحەددین.
٧- (هۆشیار)، لەدایکبووی ساڵی (1963)، دەرچووی ئامادەییە، لە تاراوگە دەژی.
٨- (نیشتیمان)، لەدایکبووی ساڵی (1964)، ڕاهێنەرە لە بەشی چاودێری کۆمەڵایەتی – هەولێر.
٩- (بەختیار)، لەدایکبووی ساڵی (1965)، دەرچووی بەشی کۆمپیوتەرە، لە زانکۆی تەکنەلۆژیا – بەغدا.

**چوارەم: ئەو پۆستانەی کە لە ماوەی ژیانیدا وەریگرتوون:**

١- ساڵی (1946) پێشنوێژ، وتاربێژ و وانەبێژ بووە، لە گوندەکەی خۆی (گوندی زەڵم).
٢- ساڵی (1947) بووەتە مەلای (گوندی سەرسییان) لە ناوچەی (ڕانیە و پشدەر).
٣- ساڵی (1949) بووەتە مەلای مزگەوتی (بن تەبەق) لە شاری سلێمانی.
٤- ساڵی (1955) کارەکەی گواستووەتەوە بۆ بەشی سەربازی، لە مێژووی (1955/١٠/٨)، بە پێشنوێژ و سەرپەرشتیاری ئایینی دیاری کراوە لە سوپای شاهەنشایی عێراقدا، پلەی ئەفسەری پلە چواری دراوەتێ، تا کۆتایی خزمەتکردنی لە بواری سەربازیدا گەیشتووەتە پلەی ئەفسەری نایاب، سەرجەمی خزمەتی لە سوپادا (17) ساڵ و (22) ڕۆژ بووە.
٥- مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی (1987) بە ڕاگری کۆلێژی یاسای زانکۆی (سەددام) لە شاری بەغدا دیاری کراوە.
٦- ساڵی (1990) بە ڕاگری کۆلێژی (سەددام)، لە شاری بەغدا دیاری کراوە، کە ئەمەیان کۆلێژێکی سەربەخۆ بووە و لەجیاتیی وەزارەتی خوێندنی باڵا، سەر بە ئەنجومەنی وەزیران بووە.
٧- لە نێوان ساڵەکانی (1975) بۆ (2007)، لە کۆلێژەکانی یاسا، لە زانکۆکانی (المستنصریە)، (زانکۆی بەغداد)، (زانکۆی نەهرەین) و (پەیمانگەی دادوەری) وانەی گوتووەتەوە، هەروەها لەم ماوەیەشدا سەرپەرشتیی نزیکەی (100) نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرای کردووە، تا ساڵی (2007)، خانەنشین کراوە.
٨- دواجار ساڵی ٢٠٠٧ وەک ڕاوێژکاری (نێچیرڤان بارزانی)ی سەرۆکی ئەنجومەنی وەرزیرانی حکومەتی هەرێمی کوردستان دامەزراوە.

**پێنجەم: بەناوبانگترینی هاوڕێکانی لە ماوەی ژیانیدا:**

دکتۆر مستەفا زەڵمی، لە ماوەی ژیانیدا، هەر لە ساڵی،(1924)ی، زاینی، تا جێگیربوونی لە شاری بەغدا، ژمارەیەکی زۆر هاوڕێ و دۆستی هەبوون، لێرەدا ناسراوترینیان دەخەینە ڕوو:
١- زانای پایەبەرز و شۆڕشگێڕ، شێخ عیززەدینی حوسەینی .
٢- زانای موفەسیری قورئان، مەلا سەعیدی زمناکۆیی.
٣- فەیلەسوفی گەورەی کورد، مامۆستا مەسعود موحەممەد، کوڕی مەلا موحەممەدی جەلیزادەی

کۆیی.

٤- شێخ ئەمینی، کوڕی شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی.

٥- مامۆستا موحەممەد، کوڕی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.

٦- زانای موفەسیری قورئان، شێخ موحەممەدی خاڵ.

٧- شێخ مستەفای پێنجوێنی.

٨- سەرۆککۆماری عێراق، دکتۆر فوئاد مەعصوم.

٩- سەرۆککۆماری پێشووی عێراق، جەلال تاڵەبانی.

١٠- سەرۆککۆماری پێشووتری عێراق، عەبدولکەریم قاسم.

١١- سەرۆککۆماری پێشووتری عێراق، عەبدولسەلام عارف.

١٢- سەرۆککۆماری پێشووتری عێراق، ئەحمەد حەسەن بەکر.

١٣- تاهیر یەحیا.

١٤- مامۆستا مەلا عومەری دێبەگەیی.

١٥- مامۆستا مەلا موحەممەدی کوڕی مامۆستا مەلا شێخ تەهای بالیسانی.

١٦- مامۆستا دکتۆر ئەحمەد بالیسانی.

١٧- مامۆستا مەلا موحەممەدی قزڵجی.

١٨- مامۆستا عەلائەددین سەججادی.

١٩- مامۆستای مێژوونوس، جەمیل ڕۆژبەیانی.

٢٠- مامۆستای مێژوونوس، شکور مستەفا.

٢١- مامۆستا عەبدولڕەحمان زەبێحی.

٢٢- مامۆستای مێژوونووس، دکتۆر کەمال مەزهەر.

٢٣- دکتۆر موحسین عەبدولحەمید.

٣٤- دکتۆر نیزامەددین عەبدولحەمید.

٢٥- دکتۆر تەها جابیر عەلوانی.

٢٦- دکتۆر موحەممەد شەریف.

٢٧- عەبدولخالق مەعروف.

٢٨- سەیدا صالح یوسفی.

٢٩- فوئاد عارف.

٣٠- بابەکر پشدەری.

٣١- دکتۆر کامیل بەصیر.

٣٢- دکتۆر نوری تاڵەبانی.

٣٣- حەبیب موحەممەد کەریم.

٣٤- خەسرەو جاف.

٣٥- کاک ئەحمەدی موفتی زادە.

٣٦- شاعیری مەزنی کورد (بێخود).

**شەشەم: کاروانی زانستیی دکتۆر مستەفا زەڵمی:**

دکتۆر مستەفا زەڵمی، ساڵی (1934) دەستی کردووە بە خوێندن، بەم ڕیزبەندییەی لای خوارەوە پەڕتووکە باوەکانی ئەو سەردەمەی لە لای ئەم مامۆستایانە خوێندووە:

١- ناسینی پیتەکان، قورئانی پیرۆز، لە گوندەکەی خۆی لە لای (میرزا فەتحوڵڵا لهۆنی).

٢- گوڵستانی سەعدی، لە لای مەلا مەحمودی

سەرگەتی لە حوجرەی (خورماڵ).
٣- عەواملی جورجانی، ئاجرومیە، تەصریفی زەنجانی، لە لای مەلا مەحمودی زارا.
٤- سەرەتای شەرحی سیوطی، لە ڕێزمانی عەرەبیدا، لە لای مەلا عەبدولڕەحمان داربەڕولەیی.
٥- پەڕتووکی ئونموزەج لە ڕێزمانی عەرەبیدا، لە لای مەلا ئەحمەدی ئەوبەری.
٦- خوێندنی پاشماوەی پەڕتووکی ئونموزەج لە ڕێزمانی عەرەبیدا، لە لای مەلا عەبدوڵڵا، لە گوندی (دەرەشیشی سەروو)، سەر بە شاری (هەڵەبجە).
٧- پەڕتووکی ئیزهار-اظهار لە ڕێزمانی عەرەبیدا، لە لای سەیید ڕەحیم خانەگایی.
٨- خوێندنی پەڕتووکی تەصریفی مەلا عەلی، لە شاری سلێمانی.
9- خوێندنی پەڕتووکی صەمەدییە لە ڕێزمانی عەرەبیدا، لە لای مەلا عەبدولڕەحمان سەردەشتی.
10- پەڕتووکی مەلا جامی لە ڕێزمانی عەرەبیدا، لە لای شێخ بابا ڕەسول - بێدەنی، مەلا حەسەن - عەبابەیلێ.

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

11- خوێندنی پاشماوەی شەرحی سیوطی لە ڕێزمانی عەرەبیدا، لە لای مامۆستا سەیید عارفی چۆڕی.
12- خوێندنی پاشماوەی پەڕتووکی شەرحی تەصریفی مەلا عەلی، لە لای مەلا مەحمودی عەنەب.
13- خوێندنی پەڕتووکی شەرحی **(السيّد عبدالله نُقره كار، علی متن الشافِيۀ)، حاشیی‌ەی (المُلاّ عبدالله يَزدی)،** لە سەر پەڕتووکی (تهذیب المنطق)ی تەفتازانی، لە زانستی (لۆژیک) دا، لە لای عەللامە مامۆستا مەلا حەمەمینی کانی سانان، لە خانەقای بیارە.
١٤- خوێندنی (آداب الگلنبوی)، لە لای مامۆستا مەلا صاحێبی تەوێڵە.
15- خوێندنی حاشییەکانی پێنجوێنی لەسەر (آداب الگلنبوی) و (برهان الگلنبوی)، لە لای مامۆستا مەلا زاهید ضیائی، لە شاری (پاوە)ی هەورامانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
16- خوێندنی پاشماوەی حاشییەکانی پێنجوێنی لەسەر (آداب الگلنبوی) و (برهان الگلنبوی)، لە لای مامۆستا مەلا عەبدولقادر دەگاگایی، لە گوندی (دەگاگا)ی ناوچەی (ژاوەرۆ)ی هەورامانی ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
17- خوێندنی پەڕتووکی شەرحی عەقائیدی نەسەفی، لە لای مامۆستا مەلا مستەفا شوێ لە ناوچەی (موکریان)، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
18- خوێندنی پەڕتووکی شەرحی موطەووەل لە زانستی ڕەوانبێژیدا، لە لای مەلا حەمەمینی قاجری، لە گوندی (دیبۆکرێ)ی ناوچەی (موکریان).
19- خوێندنی پاشماوەی پەڕتووکی شەرحی موطەووەل، لە زانستی ڕەوانبێژیدا، لە لای مامۆستا مەلا جەلال شکاک، لە گوندی (کانی سپیکە)ی ناوچەی(شنۆ - لاجان)ی ڕۆژهەڵاتی کوردستان.
٢٠- خوێندنی کۆتا بابەتەکانی پەڕتووکی شەرحی موطەووەل لە زانستی ڕەوانبێژیدا، لە لای مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لە خانەقای بیارە.
٢١- خوێندنی پەڕتووکەکانی:
- بەرگی یەکەم، لە (جامع الجوامع)، لە زانستی ئوصولی فیقهدا.
- (کتاب الخلع)، لە پەڕتووکی (تحفه المحتاج، بشرح المنهاج)، لە زانستی فیقهدا، لەسەر مەزهەبی ئیمامی شافیعی.
- **(مَنظومۀ فَرائِض الشيخ مَعروف النودَهــی)،** لە زانستی میرات دابەشکردندا.

لە گوندی (بالک)ی، ناوچەی (مەریوان)ی، ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە لای زانای بێوێنەی پایەبەرزی کورد، مامۆستا مەلا باقری بالک.

٢٢- خوێندنی بەرگی دووەمی پەڕتووکی(جمع الجوامع) لە زانستی ئوصولی فیقهدا، لە مزگەوتی (دار الاحسان)ی شاری (سنە)، لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، لە لای مامۆستا مەلا مەحمودی موفتیزادە، لە ساڵی (1943).

٢٣- لە ساڵی (1944) چووەتە گوندی (گەلاڵەی شینکایەتی)، لە دیوی باشووری کوردستان، لە لای مامۆستا مەلا موحەممەدی ڕەئیس گیرساوەتەوە، لای ئەمیش ئەم پەڕتووکانەی خوێندووە:

- پەڕتووکی (تهذیب الکلام).
- پەڕتووکی (تشریح الافلاك).
- هەردوو پەڕتوکی (رسالة الحساب) و (أشكال التأسيس) لە بیرکاریدا.

٢٤- تا دواجار لە ساڵی (1946) چووەتە شاری کۆیە، تەفسیری بەیضاوی، لە لای مەلا نورەددینی جەلیزادەي برای مەلای گەورەی کۆیە خوێندووە، هەر لای ئەویش ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە.

لە چالاکییە زانستییەکانی:

ا- ئەندامێتی لە لیژنە یاساییەکاندا:

-1 بەشداریکردن لە تاووتوێکردنی پڕۆژە یاسای مەدەنی عێراقی، ساڵی (1958)، بۆ ماوەی سێ مانگ.

-2 بەشداریکردن لە لیژنەی پێداچوونەوە بە کەموکوڕییەکانی یاساکانی عێراق، ساڵی (2002).

-3 بەشداریکردن لە لیژنەی پێداچوونەوە بە یاسای (أصول المحاكمات الجزائية)، کەموکوڕییەکانی پەیمانگەی دادوەری، ساڵی (2003).

-4 بەشداریکردن لە لیژنەی ئامادەکاری ڕەشنووسی دەستووری نوێی عێراق، ساڵی (2005).

-5 بەشداریکردن لە پڕۆژەیاسای ونبووان، شەهیدان، بە دیلگیراوان، ساڵی (1988).

-6 بەشداری لە زۆر لە دانیشتنە یاساییەکانی وەزارەتی داددا کردووە.

ب- بەشداریکردن لە کۆنگرە زانستییەکانی ناوەوە، دەرەوەی عێراق:

١- بەشداریکردن لە کۆنگرەی زانا کۆمەڵناسەکانی عەرەب، کە ساڵی (1980) لە شاری بەغدا بەستراوە.

٢- بەشداریکردن لە کۆنگرەی وەزارەتی داد، بۆ تاووتوێکردنی پرسە یاساییەکان، کە ساڵی (1988) لە شاری بەغدا بەستراوە.

٣- بەشداریکردن لە کۆنگرەی پزیشکە عەرەبەکان، کە ساڵی (1989) لە شاری بەغدا بەستراوە.

٤- بەشداریکردن لە کۆنگرەی سەندیکای پزیشکان، کە ساڵی (1993) لە شاری موسڵ بەستراوە.

٥- بەشداریکردن لە کۆنگرەی یەکێتیی زانایان کە ساڵی (2001) لە شاری موسڵ بەستراوە.

٦- بەشداریکردن لە کۆنگرەی مافی مرۆڤ لە وڵاتی (ئەردەن)، ساڵی (2002).
٧- بەشداریکردن لە کۆنگرەی (ئەنقەرە) لە وڵاتی (تورکیا)، ساڵی (2004).
٨- بەشداریکردن لە کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکان، بۆ توێژینەوەی دادوەری لە وڵاتی (ئەردەن)، ساڵی (2005).

**حەوتەم: مامۆستاکانی، قوتابییەکانی:**

**أ: مامۆستاکانی:**

دکتۆر مستەفا زەڵمی لە ماوەی ژیانی خوێندنیدا لە کوردستانی عێراق، ئێران و تەنانەت بە ناوچە عەرەبنشینەکانی عێراق، دواتر میسریشەوە، لای ژمارەیەکی بەرچاو لە زانایان خوێندوویەتی، کە ئەمانەی لای خوارەوە، ژمارەیەکن، لە ناسراوەکانییان:

١- مامۆستا سەیید عارفی چۆڕی.
٢- مامۆستا شێخ بابا ڕەسوڵی بێدەنی.
٣- مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس.
٤- مامۆستا مەلا باقری بالک.
٥- مامۆستا مەلا موحەممەدی ڕەئیس، (گەڵاڵە).
٦- مامۆستا مەلا صاحێبی تەوێڵە.
٧- مامۆستا مەلا زاهیدی ضیائی، (پاوە).
٨- مامۆستا مەلا نورالدین جەلیزادە، (کۆیە).
٩- مامۆستا مەلا حەمە سەعیدی خومخانە.
١٠- مامۆستا مەلا حەمەمینی کانی سانان.
١١- مەلا مەحمودی سەرگەتی.
١٢- مەلا کەریمی دزڵی - مەریوان.
١٣- مەلا صاڵحی زارا - سەییدسادق.
١٤- مەلا مەحمودی عەنەب.
١٥- مەلا عەبدولڕەحمان داربەڕولەیی.
١٦- مەلا ئەحمەد ئەوبەری.
١٧- مەلا سەیید ڕەحیم خانەگایی.
١٨- مەلا عەبدولڕەحمان سەردەشتی.
١٩- مەلا حەسەن - عەبابەیلێ.
٢٠- مەلا عەبدولقادر دەگاگایی.
٢١- مەلا مستەفا شوێ.
٢٢- مەلا عەلی حەمامیان – بۆکان.
٢٣- مەلا حەمەمینی قاجری.
٢٤- مەلا جەلالی شکاک.
٢٥- مامۆستا مەلا مەحمودی موفتی زادە.

- بەناوبانگترینی مامۆستاکانی لە زانکۆکانی عێراق و میسر:

٢٦- الشیخ عبدالرحیم الکشک.
٢٧- الشیخ محمد أبو سنه.
٢٨- الشیخ عبدالمقصود شلتوت.
٢٩- الدکتور شفیق العانی.
٣٠- الدکتور علی راشد.
٣١- الدکتور سلمان مرقس.
٣٢- الدکتور محمد فؤاد مهنی.
٣٣- الدکتور محمد ڕؤوف.
٣٤- الدکتور حسن چلبی.

ب: قوتابییەکانی:

١- مامۆستا مەلا سەیید ئەحمەد - نۆڵچکەیی، (مەلا پەپولە).
٢- مامۆستا مەلا سەیید موحەممەد - چنگیانی.
٣- مامۆستا مەلا موحەممەد - موکریانی.
٤- مەلا ڕەشید - بزەینانی.
٥- مەلا عەبدولڕەحمان - لە نەوەی عەللامە مەلا ئەحمەدی نۆدشەیی.

(ئەم پێنجەیان لە لای دکتۆر مستەفا زەڵمی لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابوردوودا لە مزگەوتی "بن تەبەق"، لە سلێمانی، مۆڵەتی زانستی ئایینی – مەلایەتییان وەرگرتووە).

٦- مەلا موسا - ئاکۆیان.

٧- مەلا صاڵحی بێسارانی.

٨- مەلا شێخ موحەممەد ئەمین سراج الدینی - نێزلی.

٩- ئەسعەد شێخ موحەممەد، شێخولئیسلامیی.

١٠- مەلا ئەحمەد - لۆتەری.

11- مەلا عەبدولڕەحمان - موکریانی.

12- مەلا عەبدولڕەحمان - عەینەکی.

13- مەلا ئەحمەد - واحدالعین.

14- مەلا ڕەوفی مەریوانی.

15- مەلا موحەممەدی کوڕی مەلا حەمیدی پشدەری.

16- مەلا عەبدولڕەحمان - بانەیی.

17- مەلا صاڵح کانی چناری.

18- مامۆستا مەلا شێخ ئەحمەدی ئەحمەدئاوا.

19- دکتۆر عوسمان موحەممەد غەریب (خەرپانەیی - هەورامانی).

20- دکتۆر نوعمان مونزیر شاوی و چەندەهای تر...

**هەشتەم: خۆڕاگریی دکتۆر مستەفا زەڵمی، لەسەر ئاستەنگەکانی سەر ڕێگەی خوێندن:**

نۆیەم: بەرهەمە زانستییەکانی:

یەکەم: بە زمانی عەرەبی:

**١. أحكام الزواج، وَ الطلاق فِى الفقه الإسلامى، (دِراسةُ مُقارنةُ فِى القانون).**

**٢. احكام الـميـراث، وَ الوصيةُ، وَ حق الأنِتقال.**

**٣. أخطاء أُصوليةُ لأبن السبكى، فِى كتابه جمع الجوامع.**

**٤. أسباب اباحةُ الأَعمال الجُرميةُ، (دراسةُ مقارنةُ).**

**٥. أسباب اختلاف الفقهاء فِى الاحكام الشرعيةُ. (جزءان)**

**٦. أَسْرارُ ثَوْرَةُ(١٤)، تَموُز، لِسَنَةُ(١٩٥٨).**

**٧. أُصوُل الفِقْه الإسلامى، فِى نسيجه الجديد، (جزءان).**

**٨. نَهْجُ القُرآن، فِى تَنظيم حَياةُ الأِنسان.**

**٩. الأِلْتِزامات فِى الشريعةُ الاسلاميةُ، وَ القَوانيــن الـمَدَنيةُ العَرَبِيّةُ.**

**١٠. الأِلْتِزامات فِى ضوء الـمَنْطِق، وَ الفلسفةُ.**

**١١. أهميةُ الطاقات الروحيةُ فِى الجيش.**

**١٢. أِيضاح الفَوائِد، فِى شَرْحِ القَواعِد.**

**١٣. التبيان لِرَفْع غُموض النسخ فِى القران.**

**١٤. مُستنقع العبيدِ، وَ الـجَوارى، وَ تَجفيفُهُ فِى القُرآن الكريم.**

**١٥. التَدْخيـن، وَ أَضرارهُ، وَ تَحريمُه فِى القُرآن.**

**١٦. التَعليقات عَلى تَعديل قانوُن الأَحْوال الشخصِيّةُ.**

**١٧. تفنيد مَزاعم تأثر الفِقه الإِسْلامى، بِالفِقْهِ الغَرْبى.**

**١٨. حَقُّ الـحُرّيَةُ، فِى القُرآن الكريم.**

**١٩. حُقوُقُ الإِنْسانِ، وَ ضَماناته فِى الإِسْلام.**

٢٠. حكَم أَحْكام القُرآن.
٢١. حُكْمُ التعامُل مَعَ الجيـن البَشَرى، فِى الشَريعهٔ الإسْلامِيّهٔ.
٢٢. ختانُ الأناث، أَضرارهُ، وَ تَحريمُه فِى القُرآن.
٢٣. خُطُوات الطَلاق فِى القُرآن الكَريم.
٢٤. دلالات النُصوص، وَ طُرُق أستنباط الأَحكام فِى ضَوء أُصوُل الفقه الإسْلامى.
٢٥. الدولهٔ، وَ الـمُفاضَلهٔ، بيـن النظامَيْن الـمَلَكى وَ الـجُمهوُرى.
٢٦. شَرْح قانوُن الأَحْوال الشخصيّهٔ، (أَحكام الـميـراث، وَ الوصيهٔ، وَ حق الأنتقال).
٢٧. الصِلهٔ بَيْنَ الـمَنْطِق، وَالقانوُن.
٢٨. الطَلاقُ الـمُعَلّق فِى الشَريعَهٔ الإسْلامِيّهٔ.
٢٩. الطَلاقُ الـمُقْتَرن بِالعدد، لا يَقَع به أَلاّ طَلْقَهٔ واحِدَهٔ.
٣٠. الطَلاقُ فِى الإسلام قَبْل الـمَذاهب.
٣١. مَدى سُلْطانُ الأرادهٔ فِى الطَلاق، فِى الشرائع، وَ القوانيـن، وَ الأَعراف، خِلال أَربعهٔ آلاف سنهٔ.
٣٢. الطَلاق فِى القُرآن الكَريم.
٣٣. الطلاق مَرّتان، فِى تَفاسير القُرآن.
٣٤. فَلْسَفَهُٔ الشَريعَهٔ.
٣٥. فَلْسَفَهُٔ القانوُن.
٣٦. فَلْسَفَهُٔ الـمَسؤُوليهٔ الجنائيهٔ فِى ضَوْء الفِعْل، وَالأنِفعالِ الفَلْسَفِييـن.
٣٧. فَلْسَفَهُٔ الـمَسؤُوليهٔ القانوُنِيّهٔ، فِى ضَوْء مَقولات أرسطيّهٔ.
٣٨. القانوُن الأصلَح لِلمُتّهَم فِى ضَوْء الـمتى الفَلْسَفـى.
٣٩. القُرآن، وَ قاعدهٔ الوَلَد يتبع خَيـر الأَبَوَيْن ديناً.
٤٠. القُرآن، وَ قاعدهٔ تَتَغَيّر الأَحكام، بِتَغَيُر الأَزْمان.
٤١. القَلَق، أَسْبابُهُ، أَنواعُهُ, عِلاجُهُ.
٤٢. لا رَجْمَ فِى القُرآن.
٤٣. لا قَتْل لِلْمُرْتَد غَيـر الـمُفْسد فِى القُرآن.
٤٤. الـمَبادِئ، وَ الـحُقوُق الدستوريهٔ فِى القُرآن، (مُقارَنَهٔ بِالدَساتيـر الوَضْعِيّهٔ، وَ أَعلانات حقوُق الإنْسان).
٤٥. الـمَدْخَل لِدراسهٔ الشَريعهٔ الإسْلامِيّهٔ. (تأليفُ مُشْتَرَك).
٤٦. الـمَدْخَل لِدراسهٔ الشَريعهٔ الإسْلامِيّهٔ فِى نَمطٍ جَديد.
٤٧. مركز الهَمْزهٔ، فِى لُغَهٔ العَرَب.
٤٨. الـمسؤُولِيهٔ الـجِنائِيّهٔ، فِى الشَريعهٔ الإسْلامِيّهٔ.
٤٩. مُعيـنُ القُضاهٔ، لِـتَحقيق العَدْلِ، وَ الـمُساواهٔ.
٥٠. الـمُفاضَلهٔ، بيـن النظامَيْن الـمَلَكى وَ الـجُمهوُرى.
٥١. الـمُقارَنَهٔ بَيْنَ التَخصيص وَ النَسْخ.
٥٢. الـمَنطق القانوُنى، فِى التَصَوُرات.
٥٣. منْهاجُ الإسْلام، فِى مُكافَحَهٔ الأَجْرام.
٥٤. مَوانع الـمَسؤُوليهٔ الـجِنائِيّهٔ، فِى الشَريعهٔ الإسْلامِيّهٔ، وَالتَشْريعات الـجَزائِيّهٔ العَرَبِيّهٔ.
٥٥. نَظَرِيَهٔ الأَلْتزام، بِرَد غَيْر الـمُستَحق، (دِراسَهٔ مُقارنَهٔ).
٥٦. نَظَرِيَهٔ الضَمان فِى الفِقْهِ الإسْلامِى، وَ القَوانيـن الـمَدَنِيَهٔ العَرَبِيّهٔ.
٥٧. مَجموُعَهٔ الأَبْحاثُ العِلْمِيّهٔ، (3 جلد).

دووەم: بە زمانی کوردی:

58. تەرازووی میرات، (میزان تقسیم المیراث).
59. کاروانی ژیانم، (یادداشتەکانی – دوو بەرگ).
60. مەولودنامە.

دەیەم: ئەو خەڵات و ڕێزلێنان، مێدالیا زانستییانەی وەری گرتوون:

١– نازناو و خەڵاتی (مامۆستای نایاب)ی لە زانکۆی بەغدا پێ بەخشراوە، ساڵی(1985).

٢– خەڵاتی دیوانی سەرۆکایەتیی کۆمار، ساڵی (1992).

٣– خەڵاتی (بەرهەمی زانستی، مامۆستای نموونە)، لە لایەن دیوانی سەرۆکایەتیی کۆمار، ساڵی (1993).

٤– خەڵاتی دیوانی سەرۆکایەتیی کۆمار، هەروەها خەڵاتی (ڕەمزی پەڕتووک)، ساڵی (1995).

٥– خەڵاتی ڕێزلێنانی زانایان، بە فەرمانی سەرۆکایەتیی کۆمار، ساڵی (2002).

٦– خەڵاتی وەزارەتی خوێندنی باڵا، توێژینەوەی زانستیی عێراق، ساڵی (2005).

٧– خەڵاتی زانکۆی نەهرەین، ساڵی (2006).

٨– خەڵاتی زانکۆی سەلاحەددین، ساڵی (2008).

٩– خەڵاتی کۆلێژی پۆلیس – هەولێر، ساڵی (2008).

١٠– خەڵاتی کۆلێژی (حەدبا – زانکۆی موسڵ)، ساڵی (2009).

١١– خەڵاتی (عەبدولعەزیز پاڕەزانی، بۆ کتێب)، لە شاری سلێمانی، ساڵی (2010).

١٢– خەڵاتی زانکۆی سەلاحەددین– هەولێر، ساڵی (2010).

١٣– خەڵاتی کۆلێژی پەروەردە و زانستی مرۆڤایەتی– هەولێر، ساڵی (2009).

١٤– خەڵاتی زانکۆی بەغدا، ساڵی (2009).

١٥– خەڵاتی ڕۆژی جیهانیی بەساڵاچووان، ساڵی (2011).

١٦– خەڵاتی گۆڤاری (چەکوشی یاسا)، ساڵی (2012).

١٧– خەڵاتی کۆنگرەی بەرگری لە قورئان، لە شاری سلێمانی، ساڵی (2012).

١٨– خەڵاتی زانکۆی تکریت، ساڵی (2012).

١٩– خەڵاتی یەکێتی جیهانیی، دەرچووانی ئەزهەر– قاهیرە، ساڵی (2013).

٢٠– خەڵاتی شێخی ئەزهەر– قاهیرە، ساڵی (2013).

٢١– خەڵاتی هەڵمەتی دژی توندوتیژی بەرامبەر ژنان، ساڵی (2013).

٢٢– خەڵاتی زانکۆی گەشەپێدانی مرۆیی (سلێمانی – قەرەداغ)، ساڵی (2013).

چەندەها خەڵاتی تر، بە بۆنەی شۆڕشی (14)ی تەمموزی ساڵی (1958)، شۆڕشی (6)ی کانوون، (14)ی ڕەمەزانی ساڵی (1963).

# یادەوەری لەگەڵ دکتۆر مستەفا زەڵمی

**دکتۆر فوئاد ئەحمەد بابان**
**پزیشکی پسپۆڕ و پرۆفیسۆری یاریدەدەر**
**ئەندام پەڕلەمانی خانەنشین**

ناسیاویم لەگەڵ دکتۆر مستەفا زەڵمی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی شەستەکانی سەدەی ڕابوردوو. کاتێک لە کۆلێجی پزیشکیی بەغدا دەمخوێند و سەرەڕای خوێندنەکەمان، بە کاری حزبایەتی و ڕێکخستنەوە سەرقاڵ بووین. لەو ڕۆژگارانەدا چەندین جار سەردانی مامۆستامان دەکرد لە خەستەخانەی (ڕەشید عسکری) کاتێک ئەو ئیمام تابوری سوپا بوو. مامۆستا هەمیشە پیاوێکی کەمدوو و لەسەرخۆ و دڵسۆز و کوردپەروەر بوو، دۆستێکی نزیکی زۆربەی دکتۆرەکانی ئەو کاتەی سوپا بوو، وەک دکتۆر ئەنوەر کریم مەسرەف، دکتۆر ئیبراهیم تەها، دکتۆر جەمال حسێن و چەندانی تر و بە ڕێزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرد. من و برای بەڕێزم ئەکرەمی فەقێ محمود ناوبەناو سەردانمان دەکرد، چونکە ئەکرەم

لێپرسراوی ڕێکخستنی پارتی دیموکراتی کوردستان بوو لە ناو هێزە چەکدارەکاندا و مامۆستاش لە ڕێکخستندا بوو. ئەم پەیوەندییەمان زۆر ئاسایی بوو تا گەیشتە ئەوەی ڕۆژی 19/7/1963 من و کاک ئەکرەم لەو خانووەی کە خۆمان تیایدا شاردبوویەوە، لە لایەن (حەرەس قەومی) یە بەعسییەکانەوە دەستگیر کراین. خانووەکە کەوتبووە سەر ڕێگەی (معسکر ڕەشید) لەسەر جادەی (بغداد جدیدە) و پشتی باڵەخانەیەک بوو بە ناوی (عمارە الوادی). خانووەکە بریتی بوو لە دوو ژووری لەقوڕدروستکراو. زۆربەی کات بە شەو دەهاتینە دەرەوە بۆ ڕاپەڕاندنی کاری ڕێکخستن. وا ڕێک کەوت ئەکرەم بەر لە چەند ڕۆژێک لە گرتووخانە ڕای کردبوو، داوام لێکرد لای من بێت، گوایە جێگەکەی من زۆر قایمە و لە چاوی بەعسییەکان دوورە. بەڵام بە داخەوە وا دەرنەچوو و بەڕێکەوت هەر ئەو شەوە بە هۆی ڕاوەدوونانی ئەندامانی لیژنەی ناوەندیی حزبی شیوعیی عێراق کە حەشارگەکەیان کەوتبووە تەنیشتی خانووەکەی ئێمەوە بێ ئەوەی ئێمە پێی بزانین، چونکە خانووەکەیان بریتی بوو لە خانوویەکی بچووک لە ناوەڕاستی باخچەیەکی زۆر فراواندا کە ڕووبەرەکەی چەند دۆنمێک دەبوو. ئەوە بوو پەلاماری ئێمەشیان دا و دەستگیر کراین و بە چاوبەستراوی بە چەند قۆناغێک براینە (محکمەی شەعب) لە (باب المعظم) کە ئەو زەمانە ناوەندی لێکۆڵینەوە و داپڵۆسین و کوشتن بوو. (نازم کزار) ی تاوانبار (کە لە پاش 1968 بوو بە بەڕێوەبەری گشتیی ئاسایشی عێراق)، خۆی سەرپەرشتی لێدان و هەڵواسینی دەکرد و هەر خۆیشی بە دار و سۆندە لێی دەداین. مامۆستا چووبووە خانووەکەمان، بۆیە ئەویش دەستگیر کرا و هەردووکمانیان خزاندە یەکێک لە ژوورەکان و بە پشتێنێک کە لای ئێمە گیرابوون قۆڵی هەردووکمانیان بەستەوە. لە زەویدا کەوتبوین، لەو لاشەوە هەردوو سەرکردەی حزبی شیوعی کە (جمال حیدەری، عەببەلی) بە دانیشتنەوە بوون و بەتانییەکی سەوزیان دابوو بە سەریاندا. هەرچەند ئێمە بەیەکەوە بەسترابووینەوە، بەڵام وامان نیشان نەئەدا کە یەکتری دەناسین. بەڕێکەوت کاتێک ژوورەکە چۆڵ بوو، چپانم بە گوێی مامۆستادا (خراپ تێکەوتین، دیارە ئەمە کۆتاییمانە) مامۆستاش بە چرپە وەڵامی دامەوە و وتی : (عسى ان تكرهوا فهو خير لكم!!) منیش وتم قوربان ئەم شەوکوتییە خێرەکەی لە کوێدایە؟

شەوێک هەردوو ئەحمەد حەسەن بەکر و تاهیر یەحیا کە حاکمی عەسکەریی عام بوو، خۆیان کرد بە ژوورا و دیار بوو هاتبوون بۆ ئەوەی هانی هەردوو هاوڕێکەی سەرکردەی حزبی شیوعی بدەن بۆ ئەوەی نهێنییەکانی حزب بدرکێنن و بیانبەنە بەر تەلەفزیۆن و ڕسوایان کەن، بەڵام ئەوان زۆر قارەمانانە مردنێکی جوامێرانەیان هەڵبژارد و دواڕۆژێکی پرشنگداریان بۆ خۆیان و حزبەکەیان تۆمار کرد و چوونە ڕیزی نەمرانەوە. هەر ئەو ڕۆژانە لەتەک سەدان گیراوی تردا چاوم بە (ئەبوو سەعید)ی گەورە نووسەری گۆشە بەناوبانگەکەی ڕۆژنامەی (اتحاد الشعب) کەوت، کە لە زەمانی عەبدولکەریم قاسمدا بە ئاشکرا بڵاو دەکرایەوە. (ئەبوو سەعید) لەسەر زەوی کەوتبوو، دشداشەیەکی خوێناویی لە بەردا بوو و ڕیشی هاتبوو، دیاربوو بە لێدان شەکەت بووبوو. لە خوار ئەژنۆیەوە دیار بوو هەوڵی بڕینەوەیان دابوو بە مشار، نزیکەی یەک سم چاڵ بووبوو، زۆر پەرێشان بوو. مامۆستا مستەفا لەو کاتەدا ئەو دوو لێپرسراوە هاتبوون، چونکە کۆن دەیناسین لە سوپادا، قسەی خۆی کردبوو و نازم کزاریان ڕاسپاردبوو کە بەپێی یاسا لەگەڵیدا بجوڵێتەوە. پاش کودەتاکەی 18ی تشرینی 963 بە ماوەیەک دراین بە (مەحکەمەیەکی عەسکەری) و بەردراین.

مامۆستا مستەفا پیاوێکی شارەزا و بلیمەتی ئەم زەمانەیەن کە خاوەنی دکتۆرایە لە یاسا و فیقهدا لە زانکۆی ئەزهەر. خاوەن چەندین

# مستەفا ئیبراهیم زەڵمی

پەرتووکی بەنرخ و نووسینی دەگمەنە کە لێکۆڵینەوەیەکی زانستییانەی بۆ شەریعە و دەقەکانی قورئان و فەرموودەکانی پەیامبەر کردووە. سەرپەرشتیی دەیان نامەی دکتۆرای کردووە لە بەغداد. بۆچوونەکانی لە یاسا و فیقهدا وەک سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو تێی دەڕوانرێت. مامۆستا پیاوێکی کوردپەروەری هەمیشە ڕاستگۆ بووە و لە خەباتی سیاسیدا هێمنانە بەشداری کردووە لە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستاندا. لە حیزبایەتیدا هەرگیز هەڵپەی پلەوپایەی نەکردووە و شوێن دەستکەوتی تایبەتی نەکەوتووە. تەنها هیوای ئەوە بووە بە ڕاستگۆیی و پاکی خزمەتی نەتەوەکەی بکات. بە ڕاستی نموونەی زانایەکی بێفیز و لەخۆبردوو و سادە و ساکار و ڕاستگۆ و خەباتگێڕە، کە هەمیشە بەدوای ڕاستیدا وێڵە. تەمەن درێژ بێت.

# مامۆستا مستەفا زەڵمی
## زانای گەورە و هەمیشە دڵسۆزی گەلەکەی

**د. نووری تاڵەبانی**

مامۆستا د. مستەفا زەڵمی لە بواری شەریعەتی ئیسلامی پیرۆز و قانووندا، بەتایبەتی لە بواری بەراوردکردنەوە لە نێوان پرنسیپەکانی هەردووکیان یەکێکە لە زانا هەرە گەورەکانی کوردستان و عێراق و جیهانی ئیسلامی. ئەویش وەکو مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لە ڕێگەی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە گەورەترین خزمەتی بە ئیسلام و گەلی کورد کردووە و ناوی کوردی بە جیهانی ئیسلامی لەسەر هەموو ئاستێک ناساندووە.

وەکو هەموو فەقێیەکی کوردی ئەو دەمە، لە سەرەتای ژیانی خوێندنی ئاییندا ڕووی لە چەندین ناوچەی کوردستان کردووە. ماوەیەک لە چەند دێهاتێکی ناوچەی موکریان لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان ماوەتەوە. ئاغای یەکێک لەو گوندانەی تێیدا بووە، هامشۆی شاری مهابادی کردووە، لە ڕێگەی ئەوەوە تا ڕادەیەک

مستەفا ئیبراهیم زەڵمی



ئاگاداری بارودۆخەکە بووە و جاروبار پێکەوە بیروڕاشیان گۆڕیوەتەوە. هاوینان، بەتایبەتی لە مانگی ڕەمەزاندا، لەگەڵ دانیشتوانی ئەو گوندانەی مەلایەتیی بۆ کردوون، چووەتە کوێستانەکانی ئەو ناوچەیە، بەو جۆرە تا ڕووخانی کۆمارە جوانەمەرگەکەی کوردستان و لەسێدارەدانی سەرکردەکانی ماوەتەوە. ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە ئەوەندە کاریگەر بووە لەسەری، ڕقوقینێکی زۆری لە دڵیدا چەسپاندووە دژ بە داگیرکەرانی نیشتمانە دابەشکراوەکەی و بڕیاری گەڕانەوەی بۆ کوردستانی ئەمدیو داوە، تا لە لای چەند مامۆستایێکی ئایینیی بەناوبانگ درێژە بە خوێندنەکەی بدات. لە شارەکەی حاجی قادری کۆیی لە لای شێخ نووریی جەلیزادەی برای مەلای گەورە ئیجازەی مەلایەتیی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ هەورامان، پاشان چووە بۆ سلێمانی بۆ درێژەپێدان بە خزمەتکردنی گەلەکەی لە ڕێگەی ئایینی پیرۆزەوە وەکو مەلا لە یەکێک لە مزگەوتەکانی ئەو شارە. لەبەر ئەوەی مەلایێکی خاوەن هەڵوێست بووە، گرفتی زۆری بۆ دروست کراوە، بۆیە بە ناچاری ڕووی لە ژیانی غوربەت کردووە. ئەویش وەکو مەولانا خالدی نەقشبەندی، نالی، موفتی زەهاوی، شێخ ڕەزای تاڵەبانی، شێخ عەبدولقادری خەتیب، مەلا محەمەدی قزڵجی و مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، لە بەغدا گیرساوەتەوە. وەکو لەو ئایەتە پیرۆزی قورئاندا هاتووە: "عسى ان تكرهوا شيئا وهو خير لكم"، لەو ماوەی لە بەغدا بووە، دەستی بە تەواوکردنی خوێندنی شەریعەت

و قانوون کردووه، پاشان له زانکۆکانی قاهیره بڕوانامەی دکتۆرای لە هەردووکیاندا وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە بۆ بەغدا و وەکو مامۆستا دەستی بە دەرسوتنەوە کردووە و لە ماوەیەکی کورتدا جێگەی زانستیی خۆی چەسپاندووە. لەو ماوەیەدا بوو کە پێکەوە لە کۆلێژی قانوون لە زانکۆی بەغدا مامۆستا بووین و ڕۆژانە یەکترمان دەبینی و دۆستایەتی و برایەتیمان بەهێزتر دەبوو. لە کۆتایی ساڵی 1982دا ڕژێمی بەعس خانەنشینی کردم و گەڕامەوە بۆ کوردستان، بەڵام ئاگاداری دەنگوباسی یەکتر دەبووین. لە پاش ڕووخانی ڕژێم سەردانی هەولێری کرد و بڕیاری مانەوەی دا، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی پێکەوە کار بکەین، بەتایبەتی لە کاتی ئامادەکردنی پرۆژە قانوونی باری کەسی بۆ هەرێمی کوردستان و چەند پرۆژە قانوونێکی تر.

لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەش بکرێت، پاش کۆچکردنی مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس، مامۆستایانی ئایینیی ئەهلی سوننە لە بەغدا و ناوچەکانی دیکەی عێراق کۆبوونەوەیەکی فراوانیان لە مزگەوتی ئیمامی ئەعزەم لە بەغدا ساز کردبوو و بە تێکرای دەنگ داوایان لە مامۆستا زەڵمی کردبوو لە جێگەکەی مامۆستا مودەڕیس ببێتە موفتیی عێراق، بەڵام عوزری خواستبوو، چونکە وەکو خۆی دەڵێ، بڕیاری دابوو بگەڕێتەوە بۆ کوردستان و ئەو چەند ساڵەی لە ژیانیدا ماوە، خزمەت بە گەلەکەی خۆی بکات. لەو دەمەوە، بە هاوکاریی چەند دۆستێکی نزیکی خەریکی نووسینی تازەیە، یان پێداچوونەوە بە نووسینەکانی پێشووی، کە خۆشبەختانە ئێستا دەزگایەکی بڵاوکردنەوە بڕیاری داوە لەژێر چاودێریی خۆیدا بەرهەمەکانی بکاتە کوردی، ئەوەش گەورەترین خزمەتە بە گەلەکەی لە هەموو بەشەکانی کوردستان.

مامۆستا مستەفا زەڵمی زانایەکی گەورەی کوردە، دەبێ هەموومان شانازیی پێوە بکەین و دوعای لەشساغی و تەمەندرێژیی بۆ بکەین تا بتوانێ درێژە بە خزمەتی ئایینی پیرۆز و گەلەکەی بکات، بەتایبەتی لەم بارودۆخەدا کە چەندین گرووپ و تاقم پەیدابوون و بە ناوی ئایینی پیرۆزی ئیسلامەوە بازرگانی دەکەن.

هەولێر28-08-2015

# عەللامەی زەڵمی، هەڵکەوتووی ڕۆژگار

**د. سەباح بەرزنجی**

### ١

گفتوگۆکردن لەسەر کەسایەتیی زانای گەورەی کوردستان، عەللامە مستەفا زەڵمی، کارێکی ئاسان نییە، چونکە کەسایەتییەکی فرە ڕەهەندە و تەمەنێکی درێژ و پڕ لە هەوراز و لێژی بۆ خزمەتکردن بە گەل و ئایین بەسەر بردووە، چەندین قۆناغی لە پێگە و جێگەی جیاوازدا تێپەڕاندووە و باش وایە بۆ هەر بوار و پێگەیەک کەسێک توێژینەوەی لەسەر بکات.

بەڵام هێشتا وەکو پێویستە و چاوەڕوان دەکرێت، ئاوڕ لەم زانا مەزنە نەدراوەتەوە و جێی خۆیەتی شاگرد و قوتابییەکانی زیاتر باس لە کەسایەتی و تایبەتمەندییەکانی بۆ نەوەی نوێ بکەن، بۆ ئەوەی شارەزای ئاکاری کەسی و زانستی و کۆمەڵایەتیی ئەو ببن و بیکەنە

و کوردپەروەرە...".
تەنانەت نامەی دکتۆراکەی و ماستەرەکەی مامۆستا زەڵمی لە لای خۆی دانابوو و هەر زانایەک بهاتایە بۆ سەردانی، نوسخەیەکی بە دیاری پێ دەبەخشی....
دواتر کە چوومە زانکۆی تاران، لەو کتێبانەی پێشنیازم کرد ببێتە پرۆگرامی خوێندن بۆ خوێندکارانی فیقهی شافیعی، کتێبەکەی مامۆستا بوو بە ناوی "اصول الفقه فی نسیجه الجدید"، کە خۆشبەختانە بەڕێز دکتور شێخ الاسلامی سەرۆکی بەشی فیقهی شافیعی پەسەندی کرد، چونکە بۆ خۆی لە سەردەمی فەقێیەتیدا جاروبار دەرسی لای مامۆستای زەڵمی خوێندبوو، کە هەردووکیان پێکەوە لە شاری سنەی کوردستان سوختە و موستەعید بوون...دکتۆر شێخ الاسلامی زۆر یادگاریی خۆشی ئەو کاتەی خۆیانی بۆ دەگێڕاینەوە.
دوای ئەوەش لە نامەی دکتۆراکەمدا بە پێویستم زانی باسێکی کورتی مامۆستا زەڵمی بکەم لە ڕیزی ئەو زانایانەی باوەڕیان بە نوێگەری لە کاروانی فیقهی ئیسلامیدا هەیە.

**٢**

ئەوەی لەم ماوە دوورودرێژەدا منی بەم پیاوە سەرسام کردووە، لە چەند خاڵێکدا پوخت دەبێتەوە:

نموونەی زیندووی هەڵکەوتوویی بیر و هزر و ئەخلاقی زانستی.
لە منداڵیمەوە لە ڕێگەی مەرحومی باوکمەوە "مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجی" بە ناو و ناوبانگی باش و سیفاتی بەرزی ئەم پیاوە ئاشنام، هەر ئەو ساتانە کە باوکم دەیفەرموو: "بەو هەموو زاناییەوە هێشتا خەریکی تەحقیق و بەدواداچوون و موتاڵایە". دەیفەرموو: "بەو هەموو زانستەوە کەسێکی خۆبەکەمزانە". دەیفەرموو: "کەسێکی ڕەوشتبەرز

یەکەم: توانای لەڕادەبەدەری لە تەوزیفی زانستەکانی لۆجیک و فەلسەفەی ئیسلامی لە بواری یاسا و هزری یاسایی و فەلسەفەی یاسادا.

دووەم: تێگەیشتنی قووڵ لە ناوەڕۆک و جەوهەری شەریعەتی ئیسلام و هەموو قوتابخانە فیکری و فیقهییەکانی، هەر بۆیە لە بڕیار و بۆچوون و گۆشەنیگاکانیدا هیچ جۆرە دەمارگیری و وابەستەگییەک بە ڕابوردووەوە نابینرێت.

سێیەم: کەسێکە زۆر بڕوای بە تازەگەری و ئیجتیهادی بەردەوام هەیە و لای وایە بزاڤی هزر و ئەندێشەی فیقهی ئیسلامی ناکرێت لە چوارچێوەی چوار پێنج مەزهەب یان زیاتردا قەتیس بکرێت و پێویستە ڕەوتی ڕەخنە و هەڵسەنگاندنی بابەتییانە درێژەیان پێ بدرێت.

چوارەم: لە هەموو نووسینەکانیدا قورئان و فەرموودەی ڕاست و دروستی پێغەمبەر (د. خ) بنەما و پێوەرن و لە سۆنگەی ئەوانەوە بۆ چەمکە جیاوازەکانی ژیان وکۆمەڵگە دەڕوانێت و بەپێی زانست و مەقاصیدی شەریعەت ڕێکاری گونجاویان بۆ دەدۆزێتەوە، بۆ نموونە زۆر گیروگرفتی یاسایی ئەمڕۆ بە دیدگای کراوەی خۆی و بیری مەقاصیدی چارەسەر کردووە، وەکو کێشەکانی ژنان و هەڵگەڕاوەکان و یاسای باری کەسی.

پێنجەم: ئێستاش ئەو پیاوە مەزنە وێڕای نەخۆشی و تەمەنی زۆر، هەر لە بەخشینی زانستی و هزری و عەقڵانیی خۆی بەردەوامە و درێژە بە چالاکی و داهێنان دەدات.

لە هەمان کاتدا ئاگاداری خزمان و دۆستان و قوتابیان و ناوچەی هەورامان و شارەزوور و هەموو گەلی کوردستانە و لە ڕاستیدا زانکۆیەکی زیندووە کە خوا لە کەسێکدا بەرجەستەی کردووە.

بە لای منەوە کەسایەتیی عەللامە زەڵمی کەسایەتییەکی مەوسوعیی فرەڕەهەندە، ئەو لە یەک کاتدا شەریعەتزان، یاسازان، فەیلەسوف و موتەکەللیم و بیرمەندیشە، کەسێکی وایە هەموو شەیدایەکی ئەدەب و زانست لە خزمەتیدا فێری عەقڵ و ژیان و حیکمەت و زانست دەبێ.

لە کەسایەتیی مامۆستا زەڵمیدا ڕەسەنایەتیی مودەڕیس و نۆدشی و نوێگەرایی قەرزاوی و عەبدولکەریم زەیدان و هەڵکەوتوویی یاسایی سنهوری و زەرقا بەرجەستە بووە.

لە خوای گەورە داوکارم ئەم کەسایەتییە مەزنە بە تەندروستی و بەختەوەری و تەمەنێکی زیاترەوە خۆری وجودی درەوشاوەتر بێت.

مسعود زەڵمی

# چاوپێکەوتن لەگەڵ
# مستەفا زەڵمی

**سەرگوزشتەی فەتوای حەرامکردنی ڕشتنی خوێنی کورد لە لایەن گەورە مەرجەعەکانی شیعەوە چۆن بوو...!**
**پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا زەڵمی ئەندامی یەکەم شاندی کوردی بۆ لای گەورە مەرجەعی شیعە سەماحەتی سەید موحسین ئەلحەکیم بۆ یەکەم جار چۆنیەتیی دەرکردنی ئەو فەتوایە دەخاتە ڕوو.**

**ئامادەکردنی: ڕێدار ئەحمەد**

هاوکات لەگەڵ ئەو ئاڵۆزییەی ئەم ماوەیەی دواییی نێوان هەرێمی کوردستان و حکومەتی ناوەند و لەشکرکێشیی حکومەت بۆ سەر ناوچە دابڕێنراوەکانی کوردستان، گەورە مەرجەعی شیعە سەماحەتی

سەید عەلی سیستانی فتوایەکی دەرکرد و سەرکۆنەی ئەو هەنگاوەی کرد، هەروەها لە وەڵامی پرسیاری باوکی سەربازێکی سوپای عێراقیشدا ئەوەی خستە ڕوو کە ئەگەر کوڕەکەی لە شەڕی دژ بە کورددا بکوژرێت، شەهید نییە، لەگەڵ ئەم باسەدا باسوخواسی یەکەم فەتوای حەرامکردنی ڕشتنی خوێنی کورد کە لە لایەن گەورە مەرجەعەکانی شیعەوە درابێت، هاتە ئارا، لەم دیمانەیەدا پرۆفیسۆر دکتۆر مستەفا زەڵمی چۆنیەتیی دەرچوونی یەکەم فەتوا دەخاتە ڕوو:

**- بەڕێزتان لەم ماوەیەی دواییدا کتێبێکتان دەرچووە بە ناوی "لا قتل للمرتد غير المفسد في القرآن". دەکرێت هۆکاری نووسینی ئەم بابەتەمان بۆ بخەیتە ڕوو، بەتایبەت ئەوەی پەیوەندیدار بە چوونتانەوە بۆ شاری نەجەف؟**

* ئەو پاڵنەرانەی هانیان دام ئەم هەوڵە سادەیەم بخەمە ڕوو، لە کاتێکدا کە لەسەر جێ کەوتووم و قاچێکم شکاوە و تەمەنیشم نەوەد ساڵی تێپەڕاندووە، زۆرن، گرنگترینیان قۆستنەوەی دروشمی هەڵگەڕانەوە لە دین لە لایەن زۆرێک لە فەرمانڕەوا ستەمکارەکانەوە بۆ یەکلاکردنەوەی ململانێکانیان لەگەڵ بەرانبەرەکانیان. لێرەوە دەچمە سەر نموونەیەک وەک بەڕێزیشتان پرسیارتان لەبارەوە کرد، ئەویش سەرگوزشتەی ڕاستەقینەی یەکەم فەتوایە کە گەورە مەرجەعێکی شیعە ڕشتنی خوێنی کوردی حەرام کردبێت.



عەبدولسەلام عارفی سەرۆککۆماری عێراق ساڵی 1964 داوای لە مەرجەعی باڵای شیعەی ئیمامی سەماحەتی ئایەتولا سەید موحسین ئەلحەکیم

کرد کە فەتوایەک دەربکات بۆ مافپێدانی ڕشتنی خوێنی کورد و ڕێگەدان بە لەناوبردنیان بە ژن و پیاو و مناڵ و پیرەوە، لەبەر ئەوەی لە ئایینی ئیسلام هەڵگەڕاونەتەوە و پابەندن بە فیکری شیوعیەتەوە. پێش دەرچوونی فەتواکە ئەم هەواڵە گەیشتبوو بە خوالێخۆشبوو مەلا مستەفا بارزانی -ڕەحمەتی خوای لێ بێت-. ئەویش داوای لە من و دکتۆر محەمەد شەریف و خوالێخۆشبوو کاک محەمەد عەلی محەمەدی ڕەئیس -کە ئێمە ئەو کاتە ئیمام بووین لە سوپادا- کرد بە جلوبەرگی مەلایەوە سەردانی مەرجەعی باڵای شیعەکان بکەین لە شاری نەجەف و ئەو ناڕاستی ئەو تۆمەتەی دراوەتە پاڵ کورد، کە گوایە لە ئیسلام هەڵگەڕاوەتەوە، بۆ ڕوون بکەینەوە، ئێمەش وەک ئەرکێکی ئایینی و نیشتمانی بەو کارە هەستاین، ئەوە بوو ڕۆیشتین بۆ شاری نەجەف و لە شوێنی مانەوەی پەیوەندیمان پێوە کرد و داوامان کرد دانیشتنەکەمان کەسی دیکەی لێ نەبێت، ئەوانەی لە خزمەتیدا بوون، هەموویان چوونە

دەرەوە تەنها یەک کەسیان نەبێت کە بەردەوام لە لای بوو، ئێمەش ڕاستیی ڕەوشی کوردستان و ئاییندارییی خەڵکی کوردمان بۆ ڕوون کردەوە، ئەو ستەمکارییانەمان خستە ڕوو کە حکومەت دژ بە کورد ئەنجامی دەدات و نیەتی خراپتریشی هەیە، کە ئەویش لەناوبردنی گەلی کوردە. سەماحەتی ئەلحەکیم وتی: "من وام پێ ڕاگەیەنرابوو کە ئێوە لە دین هەڵگەڕاونەتەوە و بوون بە شیوعی".

ئەو پیاوەی کە لە ژوورەکەدا لە لای مابوویەوە، وتی: "ئەی سەماحەتی بەڕێز گریمان ئەوان بوون بە شیوعی و لە دین هەڵگەڕاونەتەوە، باشە گوناهی منداڵەکانیان چییە؟ ئایا منداڵەکانیشیان مورتەدن؟ ئایا باخ و بێستانەکانیان مورتەدن؟".

سەماحەتی موحسین ئەلحەکیم پێی ڕاگەیاندین: "سڵاوم بگەیەننە بەڕێز مەلا مستەفا بارزانی و ئەوەی پێ بڵێن کە ڕێگە نادەم ئەم فەتوایە دژی کورد دەربچێت، من ئامادەم بە ماددی و مەعنەوی هاوکارتان بم، کارێکی زۆرباشتان کرد لەم کاتەدا هاتن بۆ لام و ئەو تۆمەتەی بۆ کورد هەڵبەسترابوو بۆتان ڕوون کردمەوە".

**– بە ڕای بەڕێزتان پاساوی هەڵگەڕانەوە لە دین بە شێوەیەکی نابەجێ بەکار هێنراوە و لە پشت ئەو ستەمەوە بووە کە لە کورد کراوە؟**

* کورد بەردەوام زیاتر لە نەیارەکان بە ئیسلامەوە پابەند بووە، لەبەر ئەوە ئەوان ویستوویانە ئایینی پیرۆزی ئیسلامی لە لا ناشیرین بکەن، لە شاڵاوەکانی بەناو ئەنفالیشدا کە سەدام حوسێن لە ساڵانی 1988-1987 ئەنجامی دان و بە هۆیەوە هەزاران کوردی بێتاوان بوونە قوربانی، بە پاساوی هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام بوو، دیارە "ئەنفال" زاراوەیەکە دژ بە موشریک بەکار دێت، ڕژێمی سەدام بە بەکارهێنانی ئەو زاراوەیە بۆ ناونانی شاڵاوەکانی ئەنفال نەک کوردی بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام دانا، بەڵکو کوردی بە موشریک داناوە.

ئەنفالیش سورەتێکی قورئانی پیرۆزە، خوای گەورە تیایدا دەفەرمووێت: **(يَسْأَلُونَكَ عَنِ الأَنفَالِ قُلِ الأَنفَالُ لِلّهِ وَالرَّسُولِ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ وَأَطِيعُواْ اللّهَ وَرَسُولَهُ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ).**

بە هەمان شێوە سەبارەت بە کیمیاییبارانکردنی هەڵەبجە و بالیسان و ناوچەکانی دیکەی کوردستان هەمان پاساو بۆ ئەو کۆمەڵکوژییە بەکار هێنراوە. ئەم پاساوە لە زۆر وڵاتانی دیکەی عەرەبی و ئیسلامیدا خراپ بەکار هێنراوە و بە هۆیەوە نەیارانی خۆیان پێ لەناو بردووە.

**- ئەی لە سەردەمی پێشتردا ڕەنگدانەوەی خراپ بەکارهێنانی چۆن بووە؟**

لە سەردەمانی پێشتریشدا نموونە دەبینین، هەندێ لە زانایانی ئایینی کاتێ بە گوێی فەرمانڕەواکانیان نەکردووە لەو کاتانەی کە زانیویانە فەرمانڕەواکە لە فەرمانی خوای گەورە دەرچووە، یان ئەو کاتانەی زانایانی ئایینی ئاڵای نارەزایەتییان لە دژی کارە چەوتەکانی فەرمانڕەواکە هەڵکردووە، لێرەدا بە هەڵگەڕاوە لە دینیان داناون، نموونەش وەک ئەوەی حەجاج ئەو تۆمەتەی دایە پاڵ سەعیدی کوڕی جوبەیر، لە کاتێکدا سەعید لە هەرە ئیمامە گەورەکانی تابعین بوو، هۆکاری ئەمەش تەنها ناڕازیبوونی سەعید بوو لە فەرمانڕەوایەتیی عەبدولمەلیکی کوڕی مەروان، نموونەی دیکەش ئیمام سەیفەدینی ئامەدی دانەری کتێبی "احکام الاحکام فی اصول الاحکام" و ئیمام بەلقینی و زانایانی دیکە خوا لێیان خۆش بێت.

**- ئەی لەسەردەمی ئێستادا چۆنە؟**

* لە سەردەمی ئێستادا ڕێکخراوی ئیرهابی لە زۆر وڵاتدا ئەو کارە ئەنجام دەدەن، نموونەی ئەمە لە عێراقیشدا هەیە، لە ڕێی تەقاندنەوەی بۆمب و ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو و هۆکاری دیکەی کوشتنەوە ژن و منداڵ و پیاو و پیر بە ناوی بەرگری لە ئیسلام دەکرێنە قوربانی.

**- دەکرێت بپرسین سزای هەڵگەڕاوە لە ئایین، واتە"مورتەد" لە قورئاندا چۆنە؟**

* قورئانی پیرۆز سزای هەڵگەڕاوە لە ئایینی بێزیان -مرتد غیر مفسد-ی لەو سزایانەدا داناوە کە لە ڕۆژی قیامەتدا وەردەگیرێت، هیچ فەرموودەیەکی پێغەمبەریش بەدی ناکرێت کە فەرمان بە کوشتنی کەسێک بکات تەنها لەبەر ئەوەی لە ئایین هەڵگەڕاوەتەوە.

ئەوەی هاتووە لەبارەی کوشتنی هەڵگەڕاوە لە ئایین، سەبارەت بەو کەسانەیە لە ئایین هەڵدەگەڕێنەوە و فەساد و خراپە بڵاو دەکەنەوە پاش هەڵگەڕانەوەیان، وەک خوای گەورە دەفەرمووێت: **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاءُ وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ).**

**یان لەئایەتێکی دیکەدا فەرمووەتی: (وَمَن يَرْتَدِدْ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُوْلَئِكَ حَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فِي الدُّنْيَا وَالآخِرَةِ وَأُوْلَئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ).**

**- هەندێ جار هەڕەشەی کوشتن بەکار دەهێنرێت بۆ پەشیمانبوونەوەی کەسە هەڵگەڕاوەکە لە دین تا موسوڵمان ببێتەوە. بۆ ئەمەیان چی دەڵێیت؟**

هەڕەشەکردن لە هەڵگەڕاوە لە ئایین تا پاشگەز ببێتەوە و بگەڕێتەوە سەر ئایینی ئیسلام، پێچەوانەی دەقەکانی قورئانی پیرۆزە، لەوانە ئایەتی: **(لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ).**

چونکە وشەی "اکراه" نەکیرەی واقیعە لەباری نەفیدا. بەپێی کۆڕای زانایانی ئوصولی فیقهی، "اکراه" زۆرکردن لە ناموسوڵمان بۆ موسوڵمانبوون و زۆرکردن لە هەڵگەڕاوە لە دین بۆ گەڕانەوە سەر دینەکەی دەگرێتەوە.

زۆرکردن لەسەر ئاییندار لە قورئانی پیرۆزدا ڕەت کراوەتەوە، با ئەو زۆر کردنە لە لایەن پێغەمبەرێکیشەوە بێت، ئەوەتانێ قورئانی پیرۆز سەرکۆنەی پێغەمبەر-درودی خوای لەسەر بێ- دەکات کاتێ ویستی زۆر لە کەسانێک بکات کە بەرژەوەندیی خۆیان پێش ئایین دەویست، لەو

بارەیەوە خوای گەورە دەفەرمووێت: **(وَلَوْ شَاء رَبُّكَ لآمَنَ مَن فِي الأَرْضِ كُلُّهُمْ جَمِيعاً أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ حَتَّى يَكُونُواْ مُؤْمِنِينَ).**

**لێرەدا هەمزەی "أَفَأَنتَ تُكْرِهُ النَّاسَ"** بۆ ئیستیفهانی ئینکارییە و ئەوەش توندترین جۆری نەهیی صەریحە.

پاشان هەڕەشەی کوشتن لەو کەسەی لە ئایین هەڵگەڕاوەتەوە و نەگەڕانەوەی بۆ سەر ئایینی ئیسلام بە ڕاستی دەیکاتە کەسێکی مونافیق، ڕووکەشەکەی پێچەوانەی ناخیەتی، لە ڕووکەشدا وەک تاکێکی موسوڵمان خۆی دەنوێنێت کە دروشمە ئایینییەکان جێبەجێ دەکات لەپێناوی پاراستنی بەرژەوەندیی کەسی و جەستەیی و ماددیی خۆیدا. ئاشکرایە کە مرۆڤی مونافیق لە نێو موسوڵمانانندا زۆر مەترسیدارترە لەو کەسەی بە ناخ و ڕووکەش ناموسوڵمانە.

نموونەی ئەمەش مێژوو پێمان دەڵێت هۆکاری سەرەکیی سەرنەکەوتنی موسوڵمانان لە جەنگی ئوحوددا هەبوونی هەندێ مونافیق بوو لە نێو ئەوانەدا کە بەشداریی جەنگەکەیان کرد.

پاشان فەرمانکردن بە کوشتنی مورتەدێک کە فەساد لەسەر زەوی بڵاو نەکاتەوە، فەرمانێکە کە خوا فەرمانی وای نەکردووە و پێغەمبەریش -درودی خوای لەسەر بێت-لە ژیانیدا بۆ یەک جاریش ئەنجامی نەداوە.

**با لە دزی و زینا و تاوانەکانی دیکە ورد ببینەوە. قورئانی پیرۆز سزا دنیاییەکانیانی دیاری کردووە، باشە بۆچی بێدەنگ بووە لە کوشتنی مورتەدێک تەنها لەبەر مورتەدبوونی، ئەگەر ئەمە ئەسڵێکی هەبوایە؟**

کوشتنی مورتەدێک کە فەساد لەسەر زەوی بڵاو ناکاتەوە، ڕێنماییەکانی ئیسلام دەشێوێنێت و دەیبەستێتەوە بە ئیرهابەوە، ئەو ئاماژەیەشی لێ دەکەوێتەوە کە موسوڵمانان بە زەبری بەسەر زۆر وڵاتی جیهاندا شمشێر باڵادەست بوون، لە کاتێکدا کە ئیسلام بە هۆی بنەماکانی دادپەروەری و ئازادییە ئایینییەکانی و مافپێدانی تەواوی هەر تاکێک و دانانی تەقوا و کاری بەسوود بۆ کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی وەک پێوەری چاکترین بڵاو بووەوە و بڵاو دەبێتەوە، هەروەک لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە: **(يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ).**

مەبەستیش لە تەقوا وزەی ڕۆحییە کە هانی مرۆڤ دەدات ئەو کارە چاکانە ئەنجام بدات کە خوا پێیان ڕازییە و سوودیان بۆ مرۆڤایەتی هەیە.

لە قورئانی پیرۆزدا زۆر ئایەت هەن مافی هەڵبژاردن دەدەنە دەست مرۆڤ لەوەی کە موسوڵمان ببێت یان هەر ئایینێکی دیکە، کە بە ئیرادەی ئازادی خۆی هەڵیدەبژێرێت، نموونەی ئەو ئایەتانەش خوای گەورە دەفەرمووێت: **(وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ).**

تێبینی: ئەم دیمانەیە لە ڕۆژنامەی بەیان بڵاو کراوەتەوە.

# مستەفا زەڵمی

**شێخ تەیب سەید عارف ئەبووبەکر**

پرۆفیسۆر مستەفا زەڵمی لە (کاروانی ژیان)ەکەی خۆیدا زۆر بە تەسەلی و ڕاشکاوانە هاتووە بەپیریی ڕوولێنان و داخوازیی برادەر و هەوادار و خزمانیەوە، کە مستێ لە خەرواری گەڕانەکانی بەدوای مەلۆکردنی زانست و زانیاری و کولتوورە ئایینی و کۆمەڵایەتییەکان بخاتە بەر دیدەی تامەزرۆیانی (زەڵمی)ناسی...لە کاتێکدا جەنابی پرۆفیسۆر زەڵمی وەهای پێ باشتر بوو کە ژیاننامەکەی لە دوای خۆی کەسێک یان کەسانێک کە زەڵمییان لە خۆی باشتر ناسیوە، بینووسنەوە و بیخەنە بەر دیدی هەوادارانی (زانست و لۆجیک و شەریعەت و یاسا...و زەڵمی)، ئەوەش تەنها بۆ ئەوەی کاتوساتە بەنرخەکانی

خۆی به خۆیه‌وه خه‌سار نه‌کات، به‌ڵکو ته‌رخانیان بکات بۆ لێکۆڵینه‌وه و وه‌ڵامدانه‌وه و چاره‌سه‌ری گه‌لێک له‌و که‌لێنانه‌ی که له بواره‌کانی شه‌ریعه‌ت و یاسادا به نارۆشنی یان به شێوێنراوی ماونه‌ته‌وه. بۆ ئه‌وه‌ی ئه‌و بابه‌تانه بخاته‌وه سه‌ر ڕێچکه‌ی سروشتیی خۆیان، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ئه‌و بابه‌تانه به هۆی نووکه‌پێنووس تێئاژنینه‌وه به جۆرێک ئاڵۆز کراون، ئه‌گه‌ر که‌سێکی شاره‌زا و ئاشنا به لۆجیک (منطق) و زانسته‌کانی زمانی عه‌ره‌بیی وه‌ک زه‌ڵمی نه‌بێت پێنووس و زمانی به‌ربداته ڕاڤه‌ی ئه‌و ده‌قانه‌ی که بڕیاری چاره‌نووسسازیان له پشته‌وه‌یه، ئه‌وا ئه‌و قه‌ڵه‌مبه‌ده‌ستانه نه‌ک هه‌ر خێری ماندووبوونه‌که‌یان وه‌رناگرن، به‌ڵکو ده‌بێت چاوه‌ڕوانی سزای ئاڵۆزکردن و سه‌رلێشواندنه‌که‌ش بن..

پرۆفیسۆر زه‌ڵمی به پێویستی ده‌زانێت له‌و ساڵانه‌ی له ته‌مه‌نی پڕبه‌هاوبه‌خششیدا ماویه‌تی، فریا بکه‌وێت چاره‌سه‌ری ئه‌و بابه‌تانه بکات، که به هه‌ڵواسراوی ماونه‌ته‌وه یان شێوێنراون یان که‌س توخنیان نه‌که‌وتوون، له‌به‌ر چه‌ندان هۆی وه‌ک درێژیی ڕێگه و کورتیی ته‌مه‌ن و قاتوقڕیی گوزه‌ران و ده‌ستێوه‌ردانی خه‌لیفه و سوڵتان و والییه‌کان و زۆربوونی که‌سانی شه‌ریعه‌تنه‌داری ده‌رباره‌وه که ده‌بوو پینه و پاساو و حیله‌شه‌رعی بۆ ئاخاوتنییان بدۆزنه‌وه و له سێبه‌ری وشه‌ی ناو ده‌ق و فه‌رمووده‌کاندا کنه بکه‌ن، به شیوازێک که له‌گه‌ڵ ویست و ئاره‌زووی خه‌لیفه و سوڵتانه ملهوڕه‌کاندا بگونجێت.

پرۆفیسۆر زه‌ڵمی وه‌ک خۆی بۆ ناچاریی ڕوولێنان ئاماژه‌ی کردووه، ئێمه‌ش (که ئاگاداری گه‌لێک له‌و ڕابووردووه‌ین) ئه‌زانین که کوێره گوند و دێهات نه‌مابوو بزانێت مه‌لایه‌کی ژیری لۆجیکزان و شاره‌زا له ڕێزمانی عه‌ره‌بیدا هه‌بێت و خۆی نه‌گه‌یه‌نێته لای بۆ مه‌ڵۆکردنی ئه‌و دوو زانسته هه‌ره‌گرنگه که کلیلی تێگه‌یشتنن له‌و ده‌قانه‌ی که له لای گه‌لی عه‌ره‌ب و گه‌لانی وابه‌سته‌یان چاره‌نووسسازن له ڕووی ژیان و گوزه‌ران و ده‌رفه‌تی پێکه‌وه‌ژیانه‌وه. پرۆفیسۆر زه‌ڵمی له ده‌رفه‌تی خوێندنیدا ئه‌گه‌ر له هه‌ر لایه‌ک مه‌لایه‌کی وه‌های ده‌ست بکه‌وتایه، ته‌نانه‌ت ئه‌گه‌ر له ڕووی بژێوی و گوزه‌رانه‌وه به کوله‌مه‌رگییش بژیایه، هه‌ڵیده‌کرد، بۆ ئه‌وه‌ی زۆرترین مه‌ڵۆ بخاته سه‌ر شارای دڵنیابوونه‌که‌ی و ڕه‌نجبه‌خه‌سار نه‌گه‌ڕێته‌وه بۆ به‌ر تاڤگه جوانه‌که‌ی زه‌ڵم، که مێژوو له ده‌ست داگیرکه‌ر پاراستوویه‌تی، به‌ڵام ڕاگه‌یاندنی چه‌واشه خه‌ریکن ناوی ئه‌حمه‌دئاوای به‌سه‌ردا ببڕن، له کاتێکدا وه‌ختێک زه‌ڵم زه‌ڵم بووه، کوردیک ناوی ئه‌حمه‌دئاوای نه‌بیستووه.

بگره له‌م دواییانه‌دا سه‌دان ئه‌حمه‌د و خان ئه‌حمه‌د په‌نایان بۆ زه‌ڵم و زه‌ڵمیان هێناوه و له ئه‌شکه‌وتانیدا خۆیان حه‌شارداوه و پاراستووه و خه‌مه‌کانیان داوه به‌ده‌م ئاوه زوڵاڵه‌که‌ی زه‌ڵمه‌وه و سه‌رانه‌شیان له جووتیاره شاره‌زووریه‌کان سه‌ندووه، جاروبار

مستەفا ئیبراهیم زەڵمی

خەرمانەکانیشیان سوتاندوون.

هەڵبەت لە سایەی سیستمی دەرەبەگایەتیدا بەدەگمەن بۆی ڕێک کەوتووە ڕێی لە گوندێک بکەویت کە نان و زمان و لۆجیکی تێدا بۆ دابین بکرێت. چونکە فەقێیش شوانئاسا نان و دۆکەی بە کۆکردنەوەی ئێوارانە بووە لە ماڵە جووتیار و گوندنشینە هەژارەکان کە ئەوانیش نانی شوانیان داوە لەبەر شوانی و لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان و نانی فەقێیشیان داوە بۆ پەروەردەکردنی مەلا و ڕێنماییەکانی لە بواری نوێژ و ڕۆژوو و مارەبڕین و تەڵاق و میرات و...پاش وەلاکەوتنی پیرەکانی خۆیان...

دیارە کوردەواری بێهودە ئەو پەندەی نەوتووە: (لەو شوێنەی زەوی هەیە ئاو نییە، لەو شوێنەیش ئاو هەیە زەوی نییە). لەبەر ئەوە بووە (زەڵمی) ناچار بووە لەپێناوی پرۆژەی گەڕان بەدوای زانیاریدا ڕۆژوو بکاتە پێخۆری مانەوەی لە حوجرەی مزگەوتی گوندی خەڵکە هەژارەکاندا.

پرۆفیسۆر زەڵمی دڵنیا بوو لەوەی هەر کارێک بە توندی دەستی بدەیتێ، کەمێک هەر بە دەست دەهێنی، بەڵام ئەگەر بە سستی دەستی بدەیتێ، هیچ بە دەست ناهێنی و دەستت لە بنی هەمانەبۆرەوە دەردەچێ.

دیارە پرۆفیسۆر باش دەیزانی کە لۆجیک پێوەر و کێشانەی زانستەکانە و بەبێ پسپۆری لەو بوارەدا دەستوەردان لەو دەقانەی لێکچوونیان زیاتر پێوە دیارە، وەک هەڵگرتنی تاوێرەبەرد وەهایە بۆ ڕاوکردنی ئاسکەکێوی وەک مەلا ئەبوو بەکری مصنفی چۆڕی دەفەرمووێت:

من طلب العلم بغير فهم — سيدركه اذا شاب الغراب

ومن طلب النكاح بغير مال — كان كصياد الغزال بلا كلاب

ومن اكثر الدعاء بلا ورع — كان كرام السهام الى ذباب

وعبادة الجاهلين بغير علم — كقرطاس تراه بلا كتاب

بە داخەوە هەندێک مامۆستا و مەلای مێژەرسپی خوێندنی ئەو زانستەیان بە لاوە حەرام بووە، لە کاتێکدا بۆ خۆپاراستن لە سیحر و تەڵەکەبازی بواری فێربوونی دراوە، هەر ئەو بەحەرامزانینەش وای کردووە کەمێکیان بوێرن توخنی ئەو زانستە فرەبایەخە بکەون و بە هۆشیەوە بەهرەمەند ببن، وەک جەنابی پرۆفیسو زەڵمی.

من بەش بە حاڵی خۆم پێم باشە هەر کەسێک لە زانستی لۆژیکدا بەهرەمەند نەبێت، با بەبێ مەلەوانی لەو بوارەدا کوێرانە خۆی فڕێ نەداتە گۆمی مەنگی فەلسەفە و دەقە قورئانییە لەیەکچووەکانەوە، کە بەبێ پسپۆری لە زمانەوانی و لۆژیکدا هزری سادەی ئەم مرۆڤە خۆجەنجاڵکردووە بۆی نەشیاوە لەسەر ڕاڤەی دەقێک، لە کاتێکدا توێشووە زانستییەکەی لە دەرخکردن و لەبەرکردنی هەندی پەرەگراف هیچی تری پێوە نەلکاوە، کەچی لەسەر هەندێک قیل و قالە بێپەروا ئەیکاتە گاڵە، زۆر باشیش ئەزانێ لە ئەنجامدا توێشووەکەی لەجیاتیی پەموو، هەر دڕکوداڵە.

من خۆم کە لۆژیکم لای مەلا سەید عارفی باوکم خوێندووە، باوکیشم مامۆستای پرۆفیسۆر زەڵمی بووە وەک لە ژیاننامەکەیدا بە وەفادارییەوە لە چەند شوێنیکدا ئاماژەی بۆ کردووە، زۆر دڵنیام لەوەی ئەو زاتە بەبێ لەقاڵبدانی هەر پەرەگرافیک بە جەڕومەنگەنەی لۆژیک ئۆباڵ ناخاتە ئەستۆی خۆی و خاڵبەندی بۆ هیچ پیتێک ناکات.

پرۆفیسۆر زەڵمی ئەگەر توانیی پشتئەستوور بە ئاوێتەکردنی توانای هزر و عەقڵ و لۆژیک و پسپۆڕییەکەی لە زمانی عەرەبیدا بابەتێکی کێشمەکێشاوی ڕزگار بکات لە چنگی فەرموودەکەی مەلا محەمەدی گەورەی کۆیە:

(رواه الدارقطني، حدثانا الترمذي هەمووی لە کیسی ئێمە برد هەر لە پاپۆر هەتاکو دەرزی).

ئەوە بێگومان دوو جار براوەیە، یەکەم لەبەر دۆزینەوەی ڕێگەچارەی گونجاو و بەجێ، دووەم لەبەر ئەوەی هەوڵ و کۆششی باشی کردووە، بەڵام نەهاتووە بە ئارەزوو و میزاجی خۆی و سوودمەندان، بڕیارێکی تەمومژاوی بۆ ڕاڤەی دەقێک دەربکات، کە لەم ڕۆژگارەدا بواری کنەتیاکردنی قورس و گران بێت، کە تەنها کۆدەنگی دوایین چارەیە بۆ ئەو جۆرە دەقانە.

پرۆفیسۆر زەڵمی ئەگەر زانیبای دەقیک ڕاڤەکەی لەمڕۆشدا هیچ پاساوێک هەڵناگرێ، خۆی نەخستووەتە بەر شالاو و نەشتەرگەریی دەقپەرستانەوە و چارەسەرەکەی بەسەر خۆیدا جێبەجێ کردووە، وەک ئەوەی کاتێک ناچار بوو خانووەکەی خۆی لە بەغدا بفرۆشیت، کە بووبووە زانکۆی یاسا و شەریعەت بۆ فێرخوازانی پلە باڵاکانی ئەو بوارانە، وێڕای ئەوەی بنکەی ڕامیاری و کۆمەڵایەتی بوو، کاتێک پارەی خانووەکەی وەرگرت، بە یەکسانی و بێ جیاوازی بەسەر کچ و کوڕەکانیدا دابەشی کرد و ئەو کارەی کردە نەریتێک و سوونەتێکی پەسەند بۆ ئەو کەسانەی خاوەن دارایین کە پێش لەدنیادەچوونیان بەبێ هێشتنەوەی بۆ دوای مەرگ دڵی کوڕ و کچەکانیان وەک یەک ئاسوودە بکەن و ئۆباڵی کەمبەشیی لایەک نەخەنە ئەستۆی دەقێکی قورئانی و دڵگران بن لە باوکیان پاش مردنیش.

هەڵبەت من نامەوێت لە نووسینێکی گۆڤارێکدا باس لە بەرهەمە (24) بەرگییەکەی لە شەریعەت و یاسا وگ ەلێک بواری تردا بکەم وێڕای نامیلکە و نووسینە گرانبەهاکانی تری، چونکە دەبێت تامەزرۆیانی بوارەکانی شەریعەت و یاسا خۆیان بەدوای نوێکاری و توێکارییەکانی زەڵمیدا بگەڕێن و پابەند نەبن بە کۆنەقەیدێکی قەتیس لە پەراوێزی

مستەفا ئیبراهیم زەڵمی

کتێبێکی دەستخەتی بێناونیشاندا.

ئەمڕۆ وەک جاران نییە کێشمەکێش دروست بێت لەسەر ئەوەی ئایا دەبێت (قولەتین) چەند مست ئاو بێت؟ یان فرسەخیک دەبێت چەند پێ بێت؟ یان شوێن میزەکەی مامەی چوڵگە لە مزگەوتدا بە چی و چۆن پاک دەبێتەوە...؟

ئەمڕۆ دنیا دنیای ئینتەرنێت و مانگی دەستکرد و داهێنانی خێرایە، براوە ئەو کەسەیە گوساخ و بەدەستوبردە، زانست و زانیاری گوێقوڵاخە و خۆی ماڵبەماڵ بەدوای هەوادارانیدا دەگەڕێت، بە پێچەوانەی جاران کە دەبوو فێرخواز شەونخوونی بۆ بکێشێت و کوڵبەکۆڵ بێت.

ئەو بابەتانەی پرۆفیسۆر زەڵمی تیشکی بیری تیژی ئاڕاستە کردوون، پڕبایەخن، وەک وشککردنی لیتەی کۆیلەکان (مستنقع العبید) یان بەردەبارانکردن کە یەزیدییەکان لەم چەرخەدا (دوعا)ی داماویان بە فتوای هەڵگەڕانەوە لە دین پێ سزا دا و هەموو مرۆڤایەتی بێزی لەو تاوانە سەختە کردەوە، کە دەبوو زانا ئایینییەکانی موسوڵمانان بە کۆدەنگی (اجماع) ئەو دوو بابەتەیان بە لایەکدا بخستایە، ئەوەتا پرۆفیسۆر زەڵمی توانی زۆرێک لەوپەردە ڕەشە دۆرنجاویە لەسەر ناوەڕۆکی دەقە لەیەکچووەکان هەڵبماڵێ..

ماوەتەوە بڵێین پێویستە لەمڕۆدا کە ئینتەرنێت و ئامرازەکان یتر ڕێگەی دووریان نزیک کردووەتەوە و پاساوی بێدەرامەتیی زانایانی لە گرێژنە بردووە و بیانووی بەجێ نەماوە ڕێگا لە کۆدەنگی بگرێت، کە بکرێتە بنەما بۆ چارەسەری لێکدانەوەی ئەو دەقانەی کە پێیان فرەمەزهەبی لێکەوتووەتەوە و کۆمەڵگەی دابەش کردووە، لەسەر بنەمای مەزهەبیش حزب دروست کراوە و بەو جۆرە تەوژمانە زیان بە موسوڵمانان و ئیسلام و مرۆڤایەتی گەیشتووە، کە ئەمڕۆ شەریعەتنەدارانی داعش و هاوبیرەکانیان بە پشتبەستن بەو جۆرە دەق و شێوازە ڕاڤەکردنانە فەتوای کوشتوکوشتار دەدەن و (شەلم کوێرم ناپارێزم) بە چەپ و ڕاستدا شمشێر ڕادەوەشێنن و بێباکانە فەتوای قەتڵوعام دەردەکەن و جێبەجێشی دەکەن و لە جۆرەکانی تاواندا بەرامبەر موسوڵمانانیش کە وەک خۆیان نین، داهێنان دەکەن، بێ گوێدانە چەندان دەقی هاندەر بە ڕاشکاوی بۆ پێکەوەژیان و بە کردار و ڕەفتار سەلماندنی ناوەڕۆکی گوفتار و نەفرەتکردن لە داعشیەتی بەدڕەفتار و کردار و گوفتار، کە ئەو چوار پیتە (د،ا،ع، ش) بە ڕاستی هێمای بەعس و هەموو توندڕەوێکی عەرەبی و ئیسلامییەکە (دەوڵەتی ئیرهابی عەرەبی شۆڤێنی) دەگرێتەوە.

سلێمانی 11/9/2015

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

# بەندە لە خزمەت بەرهەمەکانی د. مستەفا زەڵمیدا

**عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد ئەحمەدئاوایی**

shexnami@yahoo. com

ئەگەر بمەوێت سێرچێک بە کۆڵانەکانی هزر و شریتی عومری ڕابوردوودا بکەم، بۆ دۆزینەوەی یەکەم جاری گوێلێبوونی ناوی دکتۆر مستەفا زەڵمی لە لایەن بەندەوە، دەبێت بگەڕێمەوە بۆ سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی ڕابوردوو، ئەو کاتەی کە خۆم هێشتا لە قوتابخانەی سەرەتاییدا بووم. دوای ڕاپەڕینە جەماوەرییەکەی گەلی کوردستان دژی ڕژێمی عەفلەقی، بەرەی کوردستانیی ئەوکات جەنابی باوکمی (مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا)ی وەک قازی شەرعیی شاری هەڵەبجە دیاری کردبوو، بۆ ئەوەی

مستەفا ئیبراهیم زەلمی

تا کاتی بنیاتنانەوەی دامەزراوەکان کاروباری خەڵکی دەڤەرەکە بەڕێ بکات. لەم کاتەدا، واتە کۆتایی ساڵی (1991) کە تا ساڵی (1994)ی خایاند، هەزاران کێشەی جۆراوجۆر، بەتایبەتی پرسی تەڵاق، دەهاتنە بەردەم (مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا)، چ لە بارەگاکەی، چ لە ماڵەوە. جا لە پرسەکانی تایبەت بە تەڵاقدا گوێم لە باوکم دەبوو، کە دەیفەرموو: گرفتی فڵان تەڵاقم بەپێی فەتوای (دکتۆر مستەفا زەڵمی) چارەسەر کردووە!!

ئەمە سەرەتاکانی گوێلێبوونی ناوی ئەو زاتە بوو لە لای من. دواتریش کە زیاتر ناوەکەی زەق بوویەوە لە لام، ئەو کاتە بوو کە بابەتێکی تەڵاق هاتە بەردەم جەنابی (مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا)، کە سەرجەمی زانا ئایینییەکانی ناوچەکە بە تەڵاقێکی کەوتوویان هەژمار کردبوو، وەک (مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز – هەڵەبجە)، (مامۆستا مەلا نەجمەدین تەها – عەنەب)، (مامۆستا مەلا شێخ نورەددین موفتی)، (مامۆستا شێخ سدیق سەرگەتی) و (مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود) کە بە ڕاستی ئەمانە سەرجەمیان لە زانا هەڵکەوتوو و زۆر شارەزاکانی شەریعەتی ئیسلامی بوون لە ناوچەکەدا، بەڵام کە دواجار هاتە بەردەم جەنابی باوکم، تەڵاقەکەی بە نەکەوتوو هەژمار کرد. بێگومان ئەم بڕیارەیشی بەپێی فەتوای (دکتۆر مستەفا زەڵمی)

أضراره وتحريمه في القرآن

البروفيسور الدكتور مصطفى إبراهيم الزلمي
الأستاذ المتمرس في الشريعة والقانون

2011



دابوو. ئەم بابەتە بوو بە مقۆمقۆی نێوان خەڵک و زانایان، کە چۆن مەلایەکی وا سادە و بە تەنها خۆی پێچەوانەی ئەم هەمووە مەلا و عالمە خوێندەوارانە بووەتەوە، بۆیە دواجار پەنابرایە بەر ئەوەی کە نامەیەک بۆ بەڕێز جەنابی (دکتۆر مستەفا زەڵمی) بنووسرێت، کە ئەوکات نیشتەجێی شاری بەغدا بوو، تا ببێتە دادوەر و ئەم پرسە یەکلایی بکاتەوە کە هەق لای کام جەمسەرەیانە. دواجار وەڵامی نامە هاتەوە کە ئێستایش دەیان کەس شایەتی ئەم ڕاستییەن، کە بەڕێز جەنابی (دکتۆر مستەفا زەڵمی) نووسیبووی: لەم بابەتەدا (مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا) لەسەر هەقە، ئیتر پێویست ناکات بۆ ئەم جۆرە پرسانە ڕوو بکەنە ئەم ڕێگە نائاسابییشە و بگەنە بەغدا! بۆ

هەر گرفتێک بچنە لای ئەو. ئیدی مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا بۆ پرسی تەڵاق لە جێگەی منە!!

لە ڕاستیدا ئەم پشتگیرییەی بەڕێز جەنابی (دکتۆر مستەفا زەڵمی) لە جەنابی باوکم وای کرد هەم قورساییەکی زانستیی پێ ببەخشێت، بەتایبەتی لە فیقهی ئیسلامیدا، هەم دەمکوتی ناحەزانی بکاتەوە، کە بە جۆرەها تۆمەتی ناڕەوا تۆمەتباریان دەکرد. ئەمە لە لایەک، لە لایەکی تریشەوە دواتر زانیم کە جەنابی باوکم (مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا) لە سەرەتای پەنجاکانی سەدەی ڕابوردوودا، قوتابی و فەقێی جەنابی (دکتۆر مستەفا زەڵمی) بووە لە مزگەوتی بن تەبەقی شاری سلێمانی، ئەم ڕاستییەیش جەنابی زانای پایەبەرزی کوردستان و دوایادگاری زانایانی پێشینەی وڵاتەکەمان، جەنابی (مامۆستا نوری فارس حەمەخان) بۆی پشتڕاست کردمەوە، جا ئەم هۆکارانە و بیری نوێگەریی دکتۆر زەڵمی وای کرد، ببێتە هاندەرم بۆ ئەوەی کە وەک خزمەتکارێکی بەرهەمەکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی خۆم بناسێنم و خۆم تەرخان بکەم، ئەوەیشی کە تا ئێستا ئەنجامم داوە، ئەم پرۆسەگەلەی لای خوارەوەن:

١- دوای ئەوەی کە بۆساڵی خوێندنی (2013-2014)، لە سکوڵی زانستە ئیسلامییەکانی زانکۆی سلێمانی، بەشی خوێندنی ئیسلامی، پسپۆڕی تەفسیر و زانستەکانی قورئان، وەرگیرام، بە هۆی ئەو بیرکردنەوە و باکگراوەندەی کە لە سەر ئەم زانایە و فیکرەکەی هەمبوو، کە پێشتر باسم کرد، پێشنیازم کرد بۆ بەڕێز لیژنەی زانستیی سکوڵ، کە لەسەر د. زەڵمی نامەی ماستەرەکەم بنووسم، کە دوای لێکۆڵینەوەی تایبەت و زانستییانەی خۆیان، زۆر بە خۆشحاڵی و سوپاس بۆ خوا پەسەندیان کرد. دواجار ئەم ناونیشانەیان لێ وەرگرتم: **(جهود الدكتور مصطفى الزلمي، و منهجه فِي الدراسات القرآنيةْ)**، کە شوکر تەواوم کردووە و چاوەڕوانی موناقەشەکردنیم. شایەنی باسە بەڕێز (د. ئیسماعیل محەممەد جەلال) وەک سەرپەرشتیاری نامەکە بۆم دیاری کرا، سەرجەمی نامەکەیش لە چوار بەش پێک هاتووە و نزیکەی چوارسەد لاپەڕەی (A4)ە، کە بەشی یەکەمی تایبەتە بە ژیانی تایبەتی و پاشان ژیانی زانستیی د. مستەفا زەڵمی. بەشی دووەمی تایبەتە بە ناساندنی پەرتووکەکانی جەنابیان لە بواری ڕاڤەی قورئانی پیرۆز و زانستەکانی پەیوەندیدار پێیەوە کە سنوری پسپۆڕییەکەی بەندەیە. بەشی سێیەمیشی تەرخانە بۆ میتۆدی د. زەڵمی لە توێژینەوە قورئانییەکانیدا. بەشی چوارەمیشی

تایبەتە بە بیرورِا و فەتواکانی جەنابیان لە بواری توێژینەوە قورئانییەکانیدا، شانبەشانی لێکۆڵینەوەیەکی ورد لە سەریان.

٢- پەرچڤەکردنی پەرتووکی **(دلالات النصوص، وطرق إستنباط الأحكام، فِي ضوء أصول الفقه الإسلامي)**ی د. مستەفا زەڵمی، بۆ سەر زمانی کوردی، کە دەقە عەرەبییەکەی نزیکەی (350) لاپەرەیە و دوای بەکوردیکرانی لە لایەن بەندەوە، ئێستا ئامادەیە بۆ چاپ. شایەنی باسە کە ئەم پەرتووکە پەیرەوێکی شەرعیی و یاسایی لە رووی زانستییەوە تیادا پیادە کراوە و لە ساڵی (1976) کە دایناوە، تا ئێستا لە دەیان زانکۆی ناوەوەی عێراق و دەرەوەیدا، بە هەرێمی کوردستانیشەوە، وەک مەنهەجی خوێندن دیاری کراوە.

٣- پەرچڤەکردنی بەشی سێیەمی پەرتووکی **(أصول الفقه، فِي نسيجه الجديد)**ی د. مستەفا زەڵمی بۆ سەر زمانی کوردی، کە دەقە عەرەبییەکەی ئەمیش نزیکەی (250) لاپەرەیە و دوای بەکوردیکرانی ئەو بەشی سێیەمەی لە لایەن بەندەوە ئێستا ئامادەیە بۆ چاپ. شایەنی باسە کە بەشی یەکەم و دووەمی لە لایەن وەرگێرێکی بەرێزی ترەوە ئەنجام دراوە. ئەم پەرتووکەیشی لە دەیان زانکۆی ناوەوەی عێراق و دەرەوەیدا بە هەرێمی کوردستانیشەوە، ئێستا وەک مەنهەجی خوێندن دانراوە.

٤- پەرچڤەکردنی پەرتووکی **(الطلاق فِي القرآن الكريم)**ی

د. مستەفا زەڵمی بۆ سەر زمانی کوردی، کە لە سێ پەراوۆچکە پێک هاتووە و سەرەرای ئەوەی پێکەوە چاپ کراون، بەڵام دەکرێت بە جیاجیایش چاپ بکرێن، چونکە بابەتی سەربەخۆن و بە جیایش گرنگیی خۆیانیان هەیە، ئەمەیش ناونیشانی هەرسێ بەشەکەیەتی:

ا- بەشی یەکەم: قۆناغەکانی تەڵاق لە قورئانی پیرۆزدا.

ب- بەشی دووەم: باسی تەڵاقی هەڵپەسێردراو و سوێندخواردن بە تەڵاق.

ج- بەشی سێیەم: تەڵاقی سێ بە سێ، تەنها یەک تەڵاقی پێ دەکەوێت.

٥- پەرچڤەکردنی پەرتووکی **(الطلاق مرّتان، فِي تفاسير القرآن)**ی د. مستەفا زەڵمی، بۆ سەر

ڕێساکانی بردووەتەوە سەر بنەما ئەسڵییە شەرعییەکان و لە گێژاوی مەزهەبەکان دای ماڵیون. و دوای بەکوردیکرانی لە لایەن بەندەوە ئێستا ئامادەیە بۆ چاپ.
لە دواپەڕەگرافی ئەم وتارەیشدا ئەمەوێت ئەوە باس بکەم، کە ئەوەی ئێستا لە بەردەستمدایە سەبارەت بە جەنابی دکتۆر مستەفا زەڵمی، بریتییە لە پەڕتووکێک بە ناونیشانی (ژیان و بیروڕاکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی). ئومێدەوارم خوای گەورە موەفەقمان بکات، بۆ ئەوەی زیاتر لە خزمەتی بەرهەمەکانی ئەم زانا نوێگەر و موجتەهیدە بوێرەی هەورامان و کوردستانەکەماندا بین.

زمانی کوردی، کە پەڕاوۆچکەیەکی تایبەتە بە شرۆڤەی ئایەتی **(الطلاق مرّتان)**، کە گەورەترین و درێژترین ڕاجیایی ڕاڤیارانی قورئانی پیرۆزی لەسەرە. شایەنی باسە ئەم دوو کتێبەی چوارەم و پێنجەمی جەنابیان کە کردوومن بە کوردی، لە لایەن دەزگای ڕۆژهەڵاتەوە لە شاری هەولێر چاپ کران و لە پێشانگەی ئەمساڵی کتێبی نێودەوڵەتیی هەولێردا (2015) هەزارانیان لێ فرۆشرا، بەڵام بێگومان لەبەر گرنگیی دکتۆر و بیروڕاکانی، نەوەک لەبەر من!
٦- پەرچڤەکردنی پەڕتووکی **(الطلاق فِی الاِسلام، قبل المذاهب)**ی د. مستەفا زەڵمی بۆ سەر زمانی کوردی، کە نزیکەی بیستوپێنج ڕێسای تایبەتە بە تەڵاق، کە جەنابی دکتۆر موجتەهیدئاسا

# مستەفا زەڵمی لە بەردەم باڵاجامی مەلاحەسەنی دزلّیدا

**همایون صاحب**

بێگومان بوونی کەسایەتییەکی زانستیی وەک دکتۆر مستەفا زەڵمی لە کوردستان و کۆمەڵی کوردەواریدا مایەی دەسکەوت و قازانجێکی گەورە و شانازییەکی گەورەی ڕۆشنبیریشە کاتێک دەرکەوتنی ئەو کەسایەتییە لە ڕووبەرێکی ئایینیدا بێت. چونکە ئایین هەر لە کۆنەوە بووەتە کۆنترۆڵی ژیانی مرۆڤەکان. لە گەڵێ ڕووەوە خزمەتی گەورەی کردووە، بەتایبەتی لە ڕێکخستن و دامەزراندنی ڕەوشتیی کۆمەڵدا. هەر ئەم ئایینەش زەرەر و زیانی گەورەی لێکەوتووەتەوە کاتێک پیاوانی ئایینی نەزانانە دەستوورەکانی شەرعیان بە فیقهی کۆنکرێتیی مەزەوێک سەپاندووە بەسەر تاکە بڕوادار و سادەکاندا و هەڵگرانێک لەژێر ناوی جیاجیادا بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ئایینیان

بەکار هێناوە و بازاڕی مادی و مانەویی خۆیان پێ گەرم کردووە. ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەو دینەیە زۆربەی کوردستان باوەڕی پێهێناوە و گەلێ ناوی گەورەشی بە مێژووەکەی بەخشیوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئاستی ڕۆشنبیریی خەڵکەکە لە دۆخێکدا نییە، کە وەک گەلانی تر ئەو ئایینە بە دیوی سەرکەتن و قازانجدا بخاتە خزمەت. مستەفا زەڵمی یەکێکە لەو قارەمان و بەرگریکارانەی ژیان و گوزەرانی مەعنەویی خێزانی کوردەواری، پشتوپەنای مافەکانی تاک، فامیدە و پیری تێگەشتنی ڕاستی و قاییم و دامەزراو لە بڕوا، بەپەلە و گورجوگۆڵ لە چەسپاندنی کەلتووری مەدەنیەت. یەکەمین باسوخواسێ لە تەمەنی فەقێیەوە بووەتە کەڵکەڵەی و ئارامیی لێسەندووە و هێزی برینی ئەو ڕێگە دوورەی پێ بەخشیوە و تا ئێستاش بەڕێوەیە. (تێگەشتنی ڕاست و متمانە و بڕوابەخۆبوونە) بۆیە لە قۆناغەکانی خوێندن و سەربازیدا ئازایانە بە گژ نەزانیدا چووەتەوە. جا دەرکەوتنی ئەو جەهلە لای هەر خاوەن هێز و پایەیەکەوە بووبێت. تەنانەت داننان بە جەهلی سەردەمێکی خۆیدا، قەناعەتی ئەومان بۆ لایەنگریی زانیاری بۆ دەسەلمێنێت. لە کۆمەڵی کوردەواریدا نیکاح و تەڵاق گرنگترین مەسەلەی چارەنووسسازی هەر تاکێکە. مرۆڤ تەواوی وەڵامەکانی سکونەتکردن و ئارامی و چەشەی ڕۆحی خۆی بە زەواج وەردەگرێت. مەگەر هەر خوا بۆ خۆی بزانێت مامۆستایانی ئایینی تێنەگەشتوانە چەند مارەبڕین و نیکاحی خواقبوڵنەکردوویان لە گەورە بە بچووک و منداڵبەشوودان و خوێن و... دامەزراندبێت و چەند ماڵی پڕ لە خۆشەویستی و سکونەتشیان کاول کردبێت. زانایانی فقهی شافعی هاتنی سێتەڵاقە بە سەرزاری پیاودا لە هەر بارودۆخێکدا بێت، دەخەن و ژن و پیاو لە یەک حەرام دەکەن. ڕووبەڕووبوونەوەی زانستیانەی مامۆستا بەو مەسەلەیە ئەوی کردە تاقانە دەرکەوتووی سەردەمی ئێمە. دەبینین بوێرانە لە مەسەلەکانی نیکاح و تەڵاق و میرات و یاساکانی باری کەسێتی و هتدی کۆڵیوەتەوە و بەرهەمی خۆی بۆ نووسیوون.

هەورامییەکان و تەڵاق:
بەکاربردنی زاراوە و لەفزی تەڵاق لای زۆربەی هەورامییەکان بووەتە نەریتێکی خراپ و کولتوورێکی ناڕەسەن. بۆ هەموو شتێک و بارودۆخێکی زۆر سادە و هیچ وەک سوێند پەنای بۆ دەبەن. تەنانەت لای ئێمە پاڵەوانانی تەڵاق هەن کە تێڕوانینەکانی خۆیان بۆ ژیان و کێشەکانیان بە تەڵاق براندووەتەوە. نموونەی ئەمانە (بارام بەگ و مام جافر و کابرای نۆدشین). ئیتر تەڵاق وەک وشەیەکی پەیوەندار بە مەسەلەی شەرعەوە مەلاکانی هێناوەتە ناو ژیانی تایبەتی دایک و باوکمانەوە. باوانی وێرانی ئێمە نەزانانە دوور لە ئامانج و مەبەستی ڕاستەقینەی وشەکە، لە یەکەوە تا هەزار تەڵاقیان خستووە و وەک فەرش ڕایان خستووە. لەو کەسانەش کە وەک چاکەکار و ڕێکخەرەوەی خێزان لە ڕابوردوو و ئێستادا پەنایان وەبەر براوە، مەلاکان بوون. بە قەولی مامۆستایانی هوشیار، ئەوانیش بە جەهلی خۆیان بەربوونەتە ڕووخاندن و هەڵتەکاندنی خێزان. زاناکانیش هەردەم چوونەتە سەنگەری داماوانەی خەڵک و زانستییانە بەرامبەر نەزانیی هاوپیشەکانیان وەستاونەتەوە. لەوانە مەلا حەسەنی دزلی و مەلا مستەفای زەڵمین.

## کارگەکانی تەڵاق چاککردنەوە لە بیرەوەریی مامۆستا مستەفا زەڵمیدا

مامۆستای زەڵمی لە ناوچەی خۆییدا باش ژیاوە و بێگومان ئاگاداری کولتووری خەڵەکەش بووە. لەو ڕووەوە بێگومانم تەلاقخستنی بەردەوامی هەورامییەکان هەر لە سەرەتاوە زهن و بیری مامۆستایان بۆ ئەو مەسەلەیە وەرچەرخاندووە. ساڵی 1941، ئەو ساڵەی بە بارینی بەفر بەناوبانگە،

مامۆستا بەدوای خوێندنا لە تەوێڵەوە بۆ پاوە دەچێت، گوێی لە تەڵاقی تەوێڵەییەک دەبێت کە دەڵێ (هەرسێ تەڵاقەم کەوتبێ خوا بەشی شۆربایەک ئاوی لانەماوە، هەمووی کردووە بە بەفر). پێم وایە بیستنی ئەم جۆرە تەڵاقانە وەک پەند و قسەی خۆش و سوێندی سادە لە مامەڵەی ڕۆژانەی خەڵکیدا، پەنجەرەی فام و ئاوەز و چارەسەری زانستییانەی شەرع و پینەوپەڕۆی جاهیلانەی بەکاربەرانی لە مامۆستا کردووەتەوە. لە درێژەی کاروانی ژیان و ئەزموونە پڕ لە خێروخزمەتەکەیدا ئەو وێسگانەی پەیوەندییان بە تەڵاقەوە هەیە، کاریگەر و بەبایەختر بۆ ئێمە دەگێڕێتەوە. ڕووبەڕووبوونەوەی تێگەشتنی زانایانی فیقهی شافیعی لەمەڕ (سێ تەڵاق) وەک میراتگرەوەیەکی ئازای مەلاحەسەنی دزڵی، تەنانەت خۆبەنەزان و داننان بە دووجاری جاهلبوونی خۆیدا ئەو کاتەیە کە دوو جار تەڵاقی بە شەرعی نێرکەر (مارەبەجاش) چاک کردووەتەوە. ئەم ئیعترافەش بایەخی مامۆستایە بۆ مەسەلەکە و بێبنەمایی ئەو شەرعکردنە ساویلکانەیەش دەسەلمێنێت، کە چەندین خونچەی هەڵوەراند. مامۆستا حوجرە و ماڵی چەند مامۆستایەک لە کوردستان بە کارگەی تەڵاق چاککردنەوە ناو دەبات. من بۆ خۆم چوومەت یەکێ لەو کارگانەوە کە مامۆستا مستەفا ناوی دەبات. ساڵی 1986 ئەو کاتەی بۆ چاککردنەوەی تەڵاقی باوکم، لەگەڵ باوکم و مامەیەکمدا سەردانی مامۆستاکەیان کرد. لەبەر ئەوەی باوکم نابینا بوو، دەستیم گرتبوو، توانیم بچمە مەجلیسەکەیان. تا ئێستا ئەوە بە لامەوە سەیرە کە ئەو چاککردنەوەیە بە پارە ئەنجام درا.

**مەلا حەسەنی دزڵی (1364–1275کۆچی):**

ئەم پیاوەش هەڵکەوتووی هەورامانە و زۆربەی ژیانی لە هەردوو دیوی هەوراماندا بەسەر بردووە. بە حوکمی مەلایەتییەکەی لە دوو میحوەرەوە تووشی ناکۆکی بووەتەوە. لە لایەکەوە نەزانی و داماویی خەڵک و لە لایەکی تریش مەلا نەزانەکانی کوردەواری. دەسبردنی مەلاحەسەن بۆ باب و باسی تەڵاق و ڕووبەڕووبوونەوەی تێگەشتنی زانایانی فیقهی شافیعی لەمەڕ (سێ تەڵاق) و کەوتن و نەکەوتن و چاککردنەوە و چاکنەکردنەوەی لەوپەڕی بوێریدایە. ئەو پایەکانی حەلاڵی و نیکاح و میساق و زەواج و مەوەدە و ڕەحمە و تەدارەک و شادییەکان و ماڵ و منداڵ و زەحمەتەکانی خزمایەتی زۆر لەوە گەورەتر سەیر دەکات، کە بە ترین و لەدەمدەرچوونێکی لەفزی هەڵتەکێن و بڕوخێن. بۆیە مەسخەرە و گاڵتەی بەو مەلایانە دێت کە تێگەشتنیان بۆ تەڵاق زۆر دوورە لە چارەسەرە دینییەکە و ئەوانە دەداتە بەر مەسخەرە و تەنانەت بە کەریان دەزانێ. دەسبردنەکانی مەلا حەسەن بۆ تێکنەچوون و دامەزراندنەوەی خێزان، هێندە تێگەشتوانەیە، ئەم تێگەشتنە بووەتە پشتێکی باش و ئاوێنەیەکی ڕوونی بەردەم مستەفا زەڵمی، کە لە دۆخێکی پێشکەوتووتر و زانستییانەتردا دەربکەوێت.

شیعری تەڵاق چاککردنەوە لای مەلا حەسەن:
دوای ئەوەی کابرایەک تەلاق دەخوات بزنەکەی سەربڕێت، دوایی پەشیمان دەبێتەوە و هانا دەباتە بەر مەلای دێ، ئەویش دەڵێ ژنەکەت فڕی بە تۆوە نەماوە. مەلا حەسەن، ماڵی کابرا کاول ناکات و بەم شیعرەش پاساوی دروست بۆ کارەکەی دێنێتەوە و دوور لە ڕووتان بە مەلاکەی تریش دەڵێ زۆر کەری!

مستەفا زەڵمی

نیکاح جاری بی و کریا پا پاوەن، جا ئیتر یاوا نۆبەی زەماوەن، قەرز و هامسایا سەلەم و حاجی زەما کێشش مێ، هەر پێسە تانجی تەدارەک گیریا، شادی چەن وەشەن گۆشت و برنج و قەند و چای و ڕوەن گۆرانی واتەی، چەپڵە، هۆرپڕای لباسی زەریف، هەڵاوە و هۆرزای هەی بادەو بادەو، هەی بادەو بادە شادی و زەماوەن، موبارەک بادە هەلولەو شمشاڵ، چەپڵە و دووزەلە یۆ ماچۆ لوە، یۆ ماچۆ مەلە سوارە غارغارێن، ڕەقس و سەما و زەوق لەنجە و کناچا، مەلا مارۆ شەوق ئاخرش وەیوە، یاوا بە زاوا عەشرەت دەستتا وەش، یانەتا ئاوا! ژیوایێ تازە دەس پەنە کەرا تیلانە و سەوقات دیسانۆ بەرا بە هەزار ئومێد، هەزار ئارەزوو ژەن ئاما پەی کوڕ، کناچێ دریا شوو ئی گردە بەزمەو، ئی گرد جەنجاڵا بە ترە تەڵاقێ، ئیتر بەتاڵا؟؟ زارۆڵە وەیلان، ژەنی سەرگەردان بە دەم تڕاییێ، یانە بۆ وێران؟ ئینەت گەرەکا، مەڵڵای نا مەڵڵا بێ ڕەحم و ئینساف، لێوەی بەرەڵا خەیاڵتا "حەسەن"، ئیسڵاح کەری بە کوردی ماچو، بە خوا زۆر کەری.

ژیانی ئەو دوو مەلا تێگەشتووەی کوردستان لە زۆر ڕووەوە لە یەک دەچێت، تەنانەت دەڵێی مستەفا زەڵمی ژیانی زانستییانەی مەلا حەسەنی دزڵیی لە دۆخێکی پێگەشتووتردا دووبارە دەکاتەوە. من لەبەر ئەم خاڵانەی خوارەوە، ئەو ناونیشانەم بۆ نووسینەکەم هەڵبژارد:

-1هەردووکیان بیروڕایان سەبارەت بە مەسەلەکانی نیکاح و تەڵاق هاوشێوەیە.

-2 هەردووکیان ڕیازەتکێشانی زانست و زانیارین و ماندوو نەبوون، گومانم هەیە کە یەک هۆکار هەردووکیان بە جامعەی ئەزهەر دەگەیەنێت.

-3 مەیلیان لە سەرگوزەشتە و قسەی خۆش هەیە و نموونەی جوانیان خستووەتە ناو نووسینەکانیان.

-4 بەیعەتیان بە شێخان و پیرانی تەریقەت نەکردووە و سلبییانە لە هەندێ لەو ناوانەیان ڕوانیوە. گەرچی ئەمە بە زیانی دنیایی هەردووکیان بووە.

-5 زۆربەی هاوپیشەکانیان دژایەتییان کردووە، بێگومان هاوکێشەکە (لایستوی... )بووە.

-6 خوتبەکەی مەلا حەسەنی دزڵی لە مزگەوتی خورماڵ و هەڵوێستی مامۆستا زەڵمی لە تەسوییەی باخەکانی زەڵمدا لەیەک دەچن. پێم وایە ئەو خوتبەیە لە ژیانی مامۆستای زەڵمیدا ڕەنگی داوەتەوە.

-8 ساردییان بەرامبەر هەندێ لە شێخانی نەقشبەندی هەیە. لەگەڵ ئەوەشدا شێخانی خاکی و قانعیان خۆش ویستووە و دۆستییان لەگەڵ هەندێکیاندا کردووە.

-9 هەردووکیان لەگەڵ ئەوەی زانای گەورەن، پلەی شاعیرییان لە هەر فەقێیەکی شیعردۆست زیاتر نییە. با ناوەڕۆک و مەبەستی شیعرەکانیش گرنگ و بەهێز بێت. مەلا حەسەن بە شاعیر ناسێنراوە، بەڵام لە شاعیریەتیی زەڵمی تەنها شیعری ناو بیرەوەریەکانیم دیوە و کردوومەتە بەڵگە.


سەرچاوەکان

-1 مستەفا ئیبراهیم زەڵمی. کاروانی ژیانم بەرگی(2-1) چاپی یەکەم 2014.

-2 دیوانی مەلا حەسەنی دزڵی مەردۆخی. کۆکردنەوە: ئەحمەد نەزیری، انتشارات ئەوین 2712 کوردی.

-3 مێژوی ناودارانی کورد، بابەشێخ مەردۆخ ڕوحانی. وەرگێرانی: ماجد مەردۆخ ب 2011 هەولێر.

-4 دیدار و چاوپێکەوتنەکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی.

-5 تەڵاقەکانی بارام بەگ.

-6ڕشتەی مرواری

گۆڕستانی ئەسحاب (مەزاری مەلا حەسەنی دزڵی)

ژمارەی داهاتووی ڕۆڤار تایبەت دەبێت بە هونەرمەندی کۆچکردوو

ئازاد شەوقی

لە ماڵی پرۆفیسۆر (مستەفا زەڵمی)دا

# ئەو زانا ئایینییە کوردەی شۆڕشێکی لە تێگەیشتنی دەقە بنچینەییەکانی ئیسلامدا هەڵگیرساندووە

**هێمن خورشید**

لە زووەوە ناوی پرۆفیسۆر (مستەفا زەڵمی)م بیستبوو و لە دوورەوە دەمزانی زانایەکی گەورەیە، هەندێ قسەیم لە لایەن کەسانێکی شارەزای نووسینەکانیەوە پێگەیشتبوو.
چەند مانگێک لەمەوبەر یەک دوو کتێبێکیم خوێندەوە و ئەوەی (حەققەلیەقین) بیستبووم، بە (عەینەلیەقین) بینیم. سێ کتێبم لە وانەی خوێندبوومنەوە، کورت کردەوە و پوختەکەیم لە دیواری خۆم لە تۆڕی کۆمەڵایەتیی فەیسبووک بڵاو کردەوە.
چەند ڕۆژێک لەمەوبەر (ڕەوەند نەجم)ی هاوڕێم، هەواڵی پێدام کە لەگەڵ بەڕێز کاک (ڕێدار)ی سەرپەرشتیاری کارەکانی دکتۆر زەڵمیدا قسەی کردووە و وادەی دیدارێکی دکتۆری بۆ داناوین.
ئێوارەی ڕۆژی 5ی کانوونی یەکەمی 2014، هاوڕێ لەگەڵ بەڕێزان ڕەوەند نەجم و حەیدەر عەبدوڵڵا و بە ڕێنموونیی بەڕێز کاک ڕێدار ئەحمەد، بەرەو ماڵی زەڵمی بەڕێ کەوتین.

نزیکەی سەعاتونیوێک لەگەڵیدا دانیشتین، لەو ماوەیەدا پڕ بووین لە جوانی و هەریەکەمان چەند ساڵێک گەنج بووینەوە.

ئەگەرچی ئاسانیش نییە، وەلێ هەرچۆنێک بێت، هەوڵ دەدەم کورتەیەک لە کەشوهەوای سەردانەکە و باسوخواسەکانی خۆمانتان لەگەڵ ئەو زاتەدا بۆ بخەمە ڕوو.

وا دیار بوو ڕوحسووکیی ڕەوەند و بزۆزییەکەی، هەروەها زۆرزانی و پرسیارە وردەکانی حەیدەر کە پرسیارلێکراو بە زوویی دێننە گۆ، دکتۆر زەڵمییان خۆشحاڵ کردبوو، دەنا بە کاک ڕێداری نەدەگوت: "سوپاس بۆ ئەم سێ دیارییەی ئەمڕۆ بۆ منت هێنان"، دەنا نەیدەگوت: "ئەگەر بە من بێت نانیش دەخۆن، ئینجا دەڕۆن!". وەختێکیش وتم: پزیشکەکان دەڵێن زۆر لە لای نەخۆش دامەنیشن، بە پێکەنینەوە گوتی: "دکتۆرەکان هەم ڕاست دەکەن و هەم درۆ! بۆ هەموو کەسێک وانییە، ئێستا من حەز ناکەم ئێوە بڕۆن...".

بەهەرحاڵ، زەڵمی لەم تەمەنەیدا کە نەوەدی تێپەڕاندووە، هێندە نوکتەی بۆ گێڕاینەوە، تا گەڕاینەوە، بزە لەسەر لێومان نەبڕا، ئەو کە لەبەر شکانی لاقی تا ئێستایش ناتوانێت بە باشی ڕێ بکات، ئەو کە لەبەر پیری دەستەکانی دەلەرزن و هەندێ جار لە قسەکردندا دەوەستێت، وەختێ دەکەوێتە دوان، ئاگات لە ڕۆیشتنی کات نامێنێت و حەز دەکەیت وەک بزمار بکوترێیت بە زەویی مەجلیسەکەیدا و بۆ تاهەتایە لە لای هەڵنەستیت، وەختێ چاوەڕوانمان دەکرد و هێواشهێواش بە یارمەتیی ئەو دارەی خۆی بەسەریدا دابوو، لە ژوورەکەی ئەودیوەوە دەهات، هەر بەدەم ڕێگەوە، بە دەنگی بەرز قسەی خۆشی بۆ دەکردین، هەتا هاتە ناو ژوورەکەوە و بەخێرهاتنی کردین. وەختێکیش دانیشت، بانگی لەو کچەی خزمەتی میوانانی دەکرد، کرد: "کچێ ئەو تاقمە-مەبەستی تاقمی ددانەکەی بوو- بۆ بێنە، با نەڵێن پیر بووە!". ئێمەیش هەموو دەستمان بە پێکەنین کرد.

لەکنەیەکی هەورامی کە لە لەهجە سۆرانییەکەیدا هەیە و لە قسەکردنی هەموو هەورامییەکدا بەدی دەکرێت و هەر کەسێک ڕۆژێک لەگەڵ هەورامییەکدا دەمەتەقێی کردبێت، تێدەگات چی دەڵێم، هێندەی تر قسەکانی شیرین و بەتام کردبوو.

باسی مامۆستایەکی خۆی بۆ گێڕاینەوە بە ناوی مەلا باقی، کە کاتی خۆی ئەم فەقێی بووە، دەیگوت: "ئەوەندە شارەزا بوو لە زانستە ئیسلامییەکانی وەک فیقە و ئوسوڵ و تەفسیردا، هاوتای نەبوو، کەچی ئەوەندەیش باوەڕی بە خورافە و شتی پڕوپووچ بوو

القرآن
وقاعدة
(تتغير الأحكام بتغير الأزمان)

نەبێتەوە، باوەڕی وابوو باران لە هەورەوە نابارێت، بەڵکو لە ئاسمانەوە دێت و هەور تەنیا وەک بێژنگێک وایە و بارانەکە بە ناویدا تێدەپەڕێت، کاتێ کە چووم بۆ وڵاتی میسر بۆ خوێندن و لە ناو فڕۆکەدا بووم، فڕۆکەکەمان بەسەر هەوردا دەڕۆیشت و دەمبینی چۆن باران بە ڕوونی لە هەورەکەوە بەرەو خوار دەبووەوە، مەلا باقیم بیر کەوتەوە و لە دڵی خۆمەوە دەموت ئاخ ئێستا لێرە دەبوو و دەیبینی کە باران لە هەورەوە دەبارێت و هەور تەنیا بێژنگێک نییە!".

وەختێ ئەو بەسەرهاتەی دەگێڕایەوە، خۆی لە ئێمە زیاتر پێدەکەنی و باسی باوەڕی ئەفسانەیی هەندێ لە مەلایانی دەکرد.

ئێمە لەپەسا وەک کوردەی دۆنەدیو، پرسیارمان هەڵدەڕشت و ئەویش بە ئارامی و بەدەم تامی دەمخۆشکردنەوە، وەڵامی دەداینەوە. دەربارەی زۆر کەس پرسیارمان لێ کرد و وەڵامی داینەوە، لەبارەی کاروانی ژیانەکەیەوە پرسیمان و هەندێ شتی باس کرد کە لەوێدا باسی نەکردوون و فەرمووی: ڕەنگە بۆی زیاد بکەم، پرسیارمان دەربارەی (هێمن و هەژار) لێ کرد و ئەو نەک هەر ئەوان، بەڵکو باسی (عەبدولڕەحمان زەبیحی)یشی بۆ کردین.

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

جا وەرە من و حەیدەر و ڕەوەند یەک بگرین، چۆن هەل لە دەست دەدەین و پرسیاری مەسعود محەمەد ناکەین!

یەکێکمان پرسی: هەندێ کەس دەڵێن مەسعود محەمەد شتی بۆ حیزبی بەعس نووسیوە و بە باڵای (عودەی)یدا هەڵیداوە، فەرمووی: شتی وا ڕاست نییە، مەسعود محەمەد کوردێکی پاک بوو، پیاوێکی چاک بوو، زۆر زیرەک بوو.. پرسیم: لە نزیکەوە یەکترتان بینیبوو؟ فەرمووی: زۆر جار! وا بزانم لە سەرەتای نەوەدەکاندا بوو، پێکەوە خەڵات کراین، چووم ماچم کرد، پێی وتم: ئەتوو بۆ ناچی کچێکی جوان ماچ بکەیت، چت لە من داوە!

پرسیاری مەلای گەورەمان لێ کرد، وتی: لای نورەددینی برای دەرسم خوێندووە، بەس بە خزمەت خۆی نەگەیشتم، وەختێ چوومە کۆیە، ئەو ساڵێک بوو وەفاتی کردبوو.

لەبارەی مامۆستا عەبدولکەریمی مودەڕیسەوە پرسیمان، وتی: منی لە هەموو کوڕەکانی خۆشتر دەویست، تا دواهەناسەی دەستم لە ناو دەستیدا بوو و بەری نەدەدا.

لەبارەی مامۆستایان کاک ئەحمەدی موفتیزادە و ناسری سوبحانییەوە لێمان پرسی، وتی: بە خزمەت ناسری سوبحانی نەگەیشتبووم، تەنها کتێبێکی ئەویان بۆ هێنام خوێندمەوە.

لەبارەی موفتیزادەوە بە درێژی قسەی بۆ کردین و فەرمووی: "کاتی خۆی من ماوەیەک لە شاری (سنە)، فەقێی مەلا مەحمودی موفتی بووم، کە باوکی ئەحمەد بوو، زۆر باشەی لەگەڵمدا کرد، تەنانەت دەستنووسێکی نادر (دەگمەن)یشی لە کتێبخانەکەی خۆی پێدام، ئەو کاتە ئەحمەد زۆر منداڵ بوو، لە بێشکەدا بوو و لەلەیان بۆ گرتبوو... (دارتالایام) -ئەمە قسەی خۆی بوو- (واتە: ساڵ هات و چوو)، ساڵی 1953، لە سلێمانی، ئەحمەد هات بۆ لام و وتی: هاتووم دەرست لا بخوێنم، پێم وت: ئەگەر مزگەوتەکەیش بکەم بە ناوتەوە، هەقی باشەی باوکت نادەمەوە! بەس ئەوکات ئەحمەد هێشتا وەک دواتر ژیریی دەرنەکەوتبوو.. ". لە درێژەی قسەکانیدا دەربارەی موفتیزادە و سوبحانی، وتی: ئەو دوانە هەڵەیەکیان کرد، بەو ژیرییەوە نەدەبوایە لە ئێراندا بمانایەوە!

مامۆستا حەیدەر دەربارەی شێخ محەمەدی خاڵ

لێی پرسی، بە وردی قسەی لەبارەیەوە کرد.
دەربارەی د. عەدنان ئیبراهیم لێم پرسی، فەرمووی: بە خزمەتی نەگەیشتووم و نایناسم، وتم: بە نووسینیش نووسیومە: بۆ کتێبەکانی جەنابتی بۆ نانێرن؟ فەرمووی: ئێوە خێرتان دەگات ئەگەر ئەو کارانە بکەن.
لەبارەی د. یوسف قەرەزاوی و د. عەلی قەرەداغییەوە لێم پرسی: وتی لەگەڵ د. عەلی قەرەداغیدا پێکەوە دکتۆرامان خوێندووە. ئینجا فەرمووی ئەو دوانە فەقیهن، مێشکیشیان کراوەیە..
بەس پێی وابوو فەقیە جودایە لە عالم!
ویستم لەبارەی زاناکانی سعوودییەوە بپرسم، نەک ویستم، پرسییشم، وەلێ بانگی فەرموو و کات تەنگی پێهەڵچنین، ئەگەرچی ئەو خۆی ئامادە بوو وەڵام بداتەوە و پێییشی خۆش نەبوو هەڵستین، لێ هاوڕێکانم وتیان درەنگە و با چیدی هیلاکی نەکەین.
حەیدەر بەدەم خواحافیزیکردنەوە پێی گوت: دەزانی تۆ لای هەموو کەسێک مەقبوولی، هەموو کەس بە عەلمانی و ئیسلامییەوە تۆیان خۆش دەوێت؟ بە پێکەنینەوە گوتی: "لە چاکەی خۆیانە کە بە هەڵەدا چوون!".
دوو شت لەو پیاوەدا، لە هەموو ئاکارەکانی دیکەی زیاتر سەرنجیان ڕاکێشام:
یەکەم: یادگەی، وردودرشتی حەفتاساڵ لەمەوبەری بیر ماوە.
دووەم: شادییەک کە لەودا بینیم، مەجلیس بە نوکتەگێرانەوە دەرازێنێتەوە و خەندە لێوی جێ ناهێڵێت.
* پرۆفیسۆر مستەفا ئیبراهیم زەڵمی لەدایکبووی ساڵی 1924ی گوندی زەڵمی ناوچەی هەورامانە.
دوو دکتۆرای هەیە، ساڵی 1975 یەکێکیانی لە (فقهی بەراوردکاری)دا، لە لایەن زانکۆی ئەزهەرەوە پێبەخشراوە و ئەوی تریشیان ساڵی 2005 لە (یاسا)دا، لە زانکۆی بەغدا وەرگرتووە.
خاوەنی زیاد لە 50 کتێبە و بە بۆچوونە تازە و بوێرەکانی ناسراوە، باوەڕی وایە پێویستە لە هەموو شتێکدا بگەڕێینەوە بۆ قورئان و بنەما قورئانییەکان و سەرچاوەکانی تری شەریعەتی ئیسلامی، لە ناویشیاندا فەرموودە، بەو بپێوین.
هەندێ جار تیری ڕەخنەی سنگی زانایانی 1200 لەمەوپێشی ئیسلامیش دەپێکێت، هەربۆیە زۆرێک لە پیاوانی ئایینی دانوویان لەگەڵیدا ناکوڵێت!

# بۆ مامۆستای زەڵمی: دوو یادگاری و چەند دێڕە شیعرێک

**محەمەد ساڵح حەسەن (سەرتەک جاف)**
**خوێندکاری دکتۆرا لە بەشی کەلەپوور**

**یادگاریی یەکەم، ڕێزلێنان:**

کە مامۆستا پەڕاوێکی خۆی پێشکەش کردم بە ناوی (مدى سلطان الارادة في الطلاق في شريعة السماء وقانون الارض خلال أربعة آلاف سنة) لە دوو بەرگدا کە یەکێکە لە پەڕاوە نایابەکانی مامۆستا، من لە ڕۆژنامەی عێراقی عەرەبی (13/2/1985) نزیکەی لاپەڕەیەکم لەسەر نووسی، داوام کرد کە وێنەی دکتۆری دانەر تۆزێ دیار و گەورە بێ، وتیان: نابێ، دانەر قەوارەیەکی خۆی هەیە و هەر ئەبێ ئەوەندە بێ، یاسای ڕۆژنامەیە. منیش داواکەم بردە لای بەڕێوەبەری چاپخانە (احمد شبيب) کە مرۆڤێکی ڕۆشنبیر و نووسەر بوو، وتم: وێنەی هونەرمەند ئایا لە هونەری سەمادا بێ یان گۆرانی یان هەر بوارێکی تر گەورە دائەنرێ، با ئەمیش وابێ، من مەبەستم ئەوە نەبوو لە بەهای هونەرمەندان کەم بکەمەوە؛ چونکە

من بمەوێ و نەمەوێ ئەوان جەماوەری زۆری خۆیان هەیە، بەڵکو مەبەستم ئەوە بوو وێنەکەی ئەمیش هیچ نەبێ وەکو هیی ئەوان دابنرێ، ئەویش بە زەردەخەنەیەکەوە وتی: (کاکە احن والعلم کجا مرحبا، أحن أهل الطرب والرقص والغناء). دیارە مەبەستی ئەوە بوو: ئێمە زانامان کەمە، ئەگەر بیشبێ، هەموو کەسێ نایناسێ، وا بزانم داواشی کرد با وێنەکە تۆزێ گەورەتر بێ،. پێشینان ئەڵێن: زەڕنگەر زێڕ ئەناسێ، زەڕنگەرانی زانین لە هەموو شوێنێک کەمترن لە جگە خۆیان، بەڵام ڕێژە جیاوازە، با بڵێین: گەلی کورد ئاوەهاش بن هەر باشە؛ چونکە تا ئێستاش بە تەواویی نەبوون بە خاوەنی خاکیان لەو پارچە گوشراوانەدا کە بە دەسیانەوە ماوە1.

## یادگاریی دووەم : ڕۆحسووکی و تەوازوع و

1 بەم بۆنەوە ئەڵێم: وەکو ڕوونە، کوردستانی زوو زۆر گەورەتر بووە لە ئێستا. شاری موصل لای مێژوونووسانی غەیری کوردیش بە گرنگترین شاری کورد باس کراوە، وتراوە: سەرسنوورێکی کوردستان ڕووباری (فرات) بووە. دوای جەنگی جیهانیی یەکەم دەوری ساڵی 1923ز دابەشبوونەکەی بە تەواوی جێبەجێ کرا، کە لە ڕێکەوتنی سایکس بیکۆی ساڵی 1916ز و ڕێکەوتنی تریش بڕیاری لەسەر درابوو، نەک جەنگی چاڵدێرانی صەفەوی و عوسمانلیی ساڵی 1514 زایینی وەکو باوە؛ چونکە ساڵی 1905ز عوسمانلی ناوچەی کوردستانی ئێرانی هەموو گرتەوە، چاڵدێران جەنگی فراوانکردنی دەسەڵات و (فکری) بووە، نەک دژی نەتەوەیەک، واتە دوای جەنگی جیهانیی یەکەم و دروستبوونی دەوڵەتانی نەتەوەیی ڕەگەزیی بیرتەسک خاکی کورد هەر لەژێر گوشار و تەسکبوونەوەدایە، کە تا ئێستاش هەر بەرژەوەندیی زلهێزەکان یان هەندێکیانی تێدایە، ئەڵێم: ڕەنگە کورد بە هۆی جۆرە سروشتییەکی خاکەکەیەوە نەبوایە، ئاوەهاش نەمایەتەوە، چارەش ئەوەیە بەرپرسانی کورد لە بەرپرسانی دەوڵەتانی دەوروپشت یەکگرتووتر و زیرەکتر و خۆبەخشتر و دەسهەڵگرتووترین لە بەرژەوەندی شەخسی، ئەگەر بە پەنابردنیش بێ بۆ سیاسەتمەدارانی زۆر شارەزای بەویژدانی جیهان بۆ ڕێنموونی و چارەیەک، کە ناڵێم نییە و نەکراوە، بەڵام قەت بەپێی پێویست نەبووە.
هەندێ لە سەرچاوەکانی ئەوەی باس کرا: (تاج العروس / مرتضی الزبیدي ت:1205ز)، (9/104)، ألأکراد وبلادهم / المقدم الشیخ عبد الوحید، پێشەکی: فیلد مارشال أیوب خان، وەرگێڕەری بۆ عەرەبی: عبد السمیع سراج الدین ، لـ:130، (الحرب العالمیة الاولی وسیاسة حق تقریر المصیر) دانراوی (روبین متشل اوشروود) وەرگێڕانی بۆ عەرەبی لە لایەن (احمد السورمیري)یەوە ، لـ:56 و لاپەڕەکانی تریش ، ناسنامەی حیزبە کوردستانییەکان، مسعود عبد الخالق ، لـ: 48،47 هەروا لـ:52 ئەویش هەندێ زانیاریی لە (معجم البلدانی)ی (یاقوت) و سەرچاوەی تر وەرگرتووە.

**گوساخیی مامۆستا:**

بۆ نموونە:

ا- ماڵمان لە بەغدا لە ماڵی مامۆستای زەڵمییەوە بە پێ نیو کاتژمیر ئەبوو و نەئەبوو، ئێوارەیەکیان بینیم ئەوە مامۆستایە بە پێ هاتوە بەرەو ماڵی ئێمە، تەکان ئەدا و بە هەردوو دەستی شتێکی گرتووە بە سەر شانیەوە، قابلەمەیەک یاپراخی هێناوە بۆ ماڵی ئێمە؛ چونکە خێزانم بە دیاری منداڵێکمانەوە کە نەشتەرگەریی بۆ کرابوو، لە خەستەخانە بوو، تازە دەربڕینی وشەی شەرمەزاریم مەسەلەکە ناگۆڕێت2، ڕەنگە تا ئێرە کارەکە ئاسایی بێت، لەمە سەیرتر: مامۆستا (دکتۆر) لێم نزیک بووەوە و دەستێکی کرد بە باخەڵما، منیش ئەوەی لە باخەڵما دایناوبوو، دەرم هێنا و کردمەوە بە باخەڵیا، ئەویش کردیەوە بە باخەڵما منیش کردمەوە بە باخەڵیا، ئەویش کردیەوە.... شێوەیەک دروست بوو وەکو چنگەپرچە بکەین و شەڕمان بێ وابوو، مامۆستا بە جلی ئەفەندییەوە منیش بە جلی مامۆستای ئایینییەوە چەن کەسێک لەو دەورەدا بوون هاتن بە دەممانەوە، وتیان: بە من مامۆستا (شێخ)! پێمان بڵێ ئەوە چییە؟ ئەو کابرا چیەتی لە گەڵتا؟ منیش وتم: هیچ نییە ئەمە مامۆستامە، مامۆستا ئیسماعیلی کەلاریی جاف (وەفاتی 2010 ز) کە دراوسێیەکی نزیکترم بوو، ئینسانێکی قسەخۆش بوو، کە ڕووداوەکەم بۆ گێڕایەوە، وتی: خۆزگە دەنگت نەکردایە با هەندێ پاڵیان پێوە نایە و ئەزیەتیان بدایە، با تۆزێ ئاسایی ببێتەوە؛ چونکە جوامێری و گوساخییەکەی مامۆستا ئاسایی نییە. ئەڵێن (عقاد) نووسەری ناوداری میسر لە هەفتەیەکدا ڕۆژێکی دانابوو بۆ هاموشۆی هاوەڵان و خەڵک، بەڵام مامۆستا دەرگای هەمیشە کراوەیە و لە خزمەتی شیاوی کۆمەڵایەتیشدا بەپێی توانا کەموێنەیە.

ب- مامۆستا هەرگیز لە ڕەخنەی دڵسۆزیی لە بیروبۆچوونەکانی ڕێگر نەبووە، بەڵکو جاری

2 لەو کاتەدا مامۆستا لە دانشگای بەغدا لەقەبی (الاستاذ المتمرس)ی پێدرابوو.

وابووە خۆی داوای کردووە، بۆ پەڕاوەکەی هەردوو بەرگی (کاروانی ژیانم) داوایەتی: کێ سەرنجی هەیە با بۆ چاپی دووەم بینووسێ.

**چەند دێڕە شیعرێک :**

پارچە هۆنراوەیەکم بۆ یادکردنەوەی گەورە مامۆستایەکی ئایینی تر[3] نووسراوە، چەن دیڕە شیعرێکی بۆ ڕیزی مامۆستای زەڵمی خوا تەمەنی درێژکات بە هەندێ زیادە و گۆڕانکاریی ئەنووسمەوە؛ چونکە وەسفی زانایانی گەورە لە زۆر ڕووەوە لە یەک ئەچن :

چۆن بمەوێ وتەم چابێ نەوەک
وەکو نەبێ وابێ
لە بۆ کێ بێ بۆ گەورەیەک
بیرم کز و تێدا مابێ
بۆ گەورەکەی (دێ)کەی زەڵم
ئەوەی وتم بوو بە هەڵم
تا شکارێ بێتە کایە
هەر سەر ئەکا ڕاوی کەڵم
لە بازاڕی وشەی جوانا
وشەی بە کەڵک و شایانا
هەر ئەگەڕام و ئەمپرسی
لە بارێکی پەرێشانا
سا بەڵکو هەستی تاساوم
هەستی کز و پەشۆکاوم
بە کەرەسەی چەن وشەیەک
دەرمانی بیری ژاکاوم
بێتەوە باری ئاسایی
تا باسێکی سەرەتایی
تۆزی شیاوی پیرۆزیی
نەوەک هەر وتەی خۆڕایی
بۆ مامۆستا بە دەس بێنم
هەندێ ڕازی بدرکێنم
گۆمی مەنگی بەها و سەنگی
ئەو گەورەیە بشڵەقێنم
چەندە ئەو بازاڕە چڕ بوو به چەن
جۆری وشە پڕ بوو
بەڵام بۆمن تەواو کاکە وشەی بە
دڵ قاتوقڕ بوو
چەن هەوڵم دا بێتە کایە تاکو
بیکەم بە دەسمایە
چاوەڕێیام بهاتایە دەبوا
ئەمەش نەنووسرایە

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

---
3 مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس (وەفاتی 2005ز).

# بەسەرهاتی نووسین و چاککردنی کتێبی (التبیان لرفع غموض النسخ فی القرآن)

**دکتۆر مستەفا زەڵمی**

کاتێک کە لە قاهیرە دەمخوێند، ڕۆژێکیان لای یەکێک لەو کتێبفرۆشانەی کتێبیان لەسەر جادە دەفرۆشت، کتێبی ڕۆژهەڵاتناسێکم بەرچاو کەوت بە ناوی (الناسخ والمنسوخ فی القرآن)، زۆرم بە لاوە سەیر بوو کە ڕۆژهەڵاتناسێک کتێبێک لەبارەی قورئانەوە دابنێت، کە خوێندمەوە، لە سەرەتا تا ئاخیری کتێبەکە دەڵێت دەلیل لەسەر ئەوە کە قورئان وەحی نییە و محمد خۆی دایناوە، ناسخ و مەنسوخی تێدایە، چونکە ئەگەر کەسێک ئیمڕۆ حوکمێک دابنێ و سبەینێ لێی پەشیمان بێتەوە، نیشانەی نەقس و ناتەواوییە، خوایش

منەزەهە لە هەموو نەقسێک، واتە بوونی ناسخ و مەنسوخ لە قورئاندا گەورەترین بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە قورئان وەحی نییە و دانراوی محەمەدە. هەر ئەو کاتە لە قاهیرە بڕیارم دا دوای گەڕانەوەم بۆ عێراق، ماوەیەک لە ژیانم تەرخان بکەم بۆ دیراسەی ئەم مەوزوعە.

ساڵی 1995 تووشی نەخۆشی دڵ بووم، وتم نەخۆشیی دڵ ئینزاری مردنە، با بگەڕێمەوە سەر ئەو وەعدەی داومە لە بابەت دیراسەی نەسخ لە قورئاندا.

بۆ یەکەم جار چوومە شارع متنبی، هەرچی دەستم کەوت لە تەفسیرەکانی قورئان، کڕیم، هەرچیش لە بابەت نەسخ نووسرابوو، یان کڕیم یان ئیستنساخم کرد. لە پاش ئەوە سێ مانگ تەنیا ئەم تەفسیر و کتێبانەم خوێندەوە، هیچ شتێکم نەنووسی لە بابەت نەسخەوە. دوای ئەوە بۆم دەرکەوت کە هەڵەی موسوڵمانەکان و ئیجماعیان لەسەر ئەوەی کە قورئان بەشێکی نەسخ کراوەتەوە، سەرچاوەکەی ئەوەیە، لە زەمانی پێغەمبەرو سەحابەکانی و تابیعین و تابیعی تابیعین، بە تەخصیصی نەسخی عامیان دەوت نەسخ، بە تەقیدی نەصی موتڵەقیان دەوت نەسخ، بە بەیانی موجمەلیان دەوت نەسخ، بە تەدەوجیان دەوت نەسخ، بە ڕوخسەتیان دەوت نەسخ، بەڵام لە پاشاندا زانایانی ئوسوڵی فیقهی ئیسلامی مەعنای نەسخیان گۆڕی بەم جۆرە کە بریتییە لە ئیلغاکردنەوەی حوکمێکی شەرعی سابق بە دەلیلێکی شەرعی دواتر.

ئینجا لەسەر ئەمە هەموو بڕیاریان دا کە نەسخ لە قورئاندا هەیە و ئیستدلالیان دەکرد بە قسەی صەحابەکان و تابیعین، نەیاندەزانی کە مانای نەسخ لای صەحابە و تابیعین غەیری ئەم مەعنا تازەیەیە، هەر بەم جۆرە، هەموو زاناکانی ئوسوڵی فیقهی ئیسلامی ئیتفاقیان کرد لەسەر ئەوە کە زیاتر لە (250) ئایەت لە قورئاندا نەسخ کراوەتەوە.

لە لایەکی ترەوە هەڵەیەکی تری زانایانی ئوسوڵ ئەوە بوو فەرقیان نەدەخست لە بەینی مەرجەکانی نەسخی قورئان و مەرجەکانی نەسخی سوننەتی پێغەمبەر.

منیش بە پشتیوانیی خوا دەستم کرد بە دانانی کتێبێک، تا بە بەڵگەی عەقڵی و نەقڵی بیسەلمێنم کە یەک ئایەت نییە لە قورئاندا نەسخ کرابێتەوە بە مانای (ئیلغا)، سێ ساڵ هەر خەریکی ئەم ئیشە بووم، کاتی وا هەبوو ڕۆژی سێ سەعات لەسەری ئیشم دەکرد، سەرەڕای نەخۆشیی دڵەکەم، کەچی هەستم بە ماندووبوون نەدەکرد، بەڵام ئەگەر لاپەڕەیەک لە شتێکی ترم بنووسیایە بۆ ماوەی بیست دەقیقە، ماندوو دەبووم، دەبوایە بچم ئیسراحەت بکەم.

لە پاش ئەوەی کتێبەکەم تەواو کرد، دوو نوسخەم برد بۆ وەزارەتی ئیعلام و داوای ڕەزامەندی لەسەر چاپکردن و بڵاوکردنەوەیم کرد لەسەر ئەرکی خۆم، لەبەر ئەوەی ئەمە کتێبێکی ئایینییە، وەزارەتی ئیعلام ناردی بۆ ئەوقاف، لە ئەوقاف لیژنەیەکیان گرت لە پێنج مەلا، کە بۆ بڕیاردان لەسەر کتێبەکەم کۆ بوونەوە، وتیان پێویستە ئەم کتێبە بسووتێنرێت، بۆ ئەوەی نەکەوێتە بەردەستی خەڵک و بڵێن لە قورئاندا نەسخ نییە.

وەختی خۆی (ابو مسلم الاصفهانی) تەفسیرێکی داناوە بیست بەرگ بووە و باسی ئەوەی کردوە کە نەسخ لە قورئاندا نییە، زانا موسوڵمانەکان لە دژی وەستاون و تەفسیرەکەیان سووتاندووە، بۆ ئەوەی ناوی نەبوونی نەسخ بڵاو نەبێتەوە، هەر بەو جۆرە لیژنەی ئەوقاف بڕیاریان دا کتێبەکە بسووتێنن. یەکێک لە ئەندامانی لیژنەکە پێشتر قوتابیی خۆم بوو، سەرپەرشتیاری بڕوانامەی

دکتۆر مستەفا زەلمی لەگەڵ حاجی مخلص خاوەنی نووسینگەی تەفسیر- هەولێر.

دکتۆراکەی بووم، ئەو معارز دەبێت و دەڵێت بینێرنەوە بۆ خاوەنەکەی.
دوای چوار مانگ کە مراجعەی وەزارەتی ئیعلامم کرد، وتیان کتێبەکەتمان نارد بۆ ئەوقاف و لیژنەی ئەوقاف ڕەفزیان کرد کە بڵاو بکرێتەوە، چونکە مخالیفی ئیجماعی موسوڵمانانە.
منیش چووم بۆ لای وەزیری ئەوقاف، (د. عبدالمنعم)، کە لە حەج هاتبووەوە، وتم: یەکەم، هاتووم بەخێرهاتنەوەت بکەم. دووەم، کتێبێکم داناوە و زۆر ماندوو بووم پێیەوە، لیژنەی ئەوقاف بڕیاری داوە کە بڵاو نەکرێتەوە، لەبەر ئەوەی مخالیفی بیروڕای هەموو موسوڵمانانە، تکایە لیژنەیەکی تر پێک بهێنە بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبە، بەڵام با لیژنەکە کەسانی تێگەیشتوو بن، لە قسەکانم تێبگەن. هەر کاتێک کە کۆ بوونەوە تا بڕیاری لەسەر بدەن، خەبەرم بدەنێ تا خۆشم ئامادە بم.
وتی: منیش بڕیار دەدەم لەگەڵ تۆ حازر بم.
لیژنەیەکی تری پێک هێنا، سەرۆکی لیژنەکە زانایەکی کورد و پیاوێکی تێگەیشتوو بوو، بەڵام زۆر ترسنۆک بوو، وەعدیان پێدام کە جارێکی دیکە سەر بدەمەوە لە ئەوقاف و ئەنجامی کتێبەکە وەربگرم. کە ڕۆیشتم، دەبینم دووبارە بڕیاریان داوە لەسەر مەنعکردنی بڵاوکردنەوەی لە نێو جیهانی ئیسلامیدا. منیش قورئانێکم لەگەڵ خۆم بردبوو، وتم بە سەرۆکی لیژنەکە: (هل توجد في القرآن آيتان متناقضتان؟) واتە: ئایا لە قورئاندا دوو ئایەتی دژیەک هەن کە پێکەوە کۆ نەبنەوە؟

وتی: (استغفر الله)، وتم: نەسخیش استغفر الله، نەسخ بۆ لابردنی دژایەتی و (تناقض)ی نێوان دوو ئایەتە، ئەگەر دژایەتی نەبێت، نەسخیش نییە.

وتم: من هیچ شتێکم نییە لە دنیادا جگە لە خانوویەک کە خۆم و ماڵ و منداڵم تیایدا دەژین، ڕووبەرەکەی (620م)، لە ناوەڕاستی بەغدا و دوو تابقە، بە لای کەمەوە ئێستا بیفرۆشم (500) ملیۆن دینارم بۆ دەکا، من وەعد دەدەم لە لای خوا، بۆ هەموو زانایانی ئیسلامی لە ناوەوە و دەرەوەی عێراق، ئەگەر بیسەلمێنێت دوو ئایەتی دژیەک هەن لە قورئاندا، ئایەتی دوایی پێشووەکەی ئیلغا کردووەتەوە بۆ نەهێشتنی دژیەکییەکە، من ئەو خانووەی لەسەر تاپۆ دەکەم لە دائیرەی تەسجیلی عەقاری بەبێ موقابل.

ئەوانیش وتیان: 15 ڕۆژ مۆڵەتمان بدەرێ.

وتم: بڕۆن مانگێک مۆڵەتتان دەدەمێ.

ئەوانیش لەو ماوەیەدا نوسخەیەک لە کتێبەکە و عەریزەیەکیان نارد بۆ (صدام حسین) کە مامۆستایەک لە زانکۆکەی تۆ کتێبێکی داناوە موخالیفی ئیجماعی هەموو عالەمی ئیسلامییە. سەرۆکایەتی کۆماریش بڕیاری دەکرد لەسەر قەدەغەکردنی چاپکردنی ئەم کتێبە لە ناوەوە و دەرەوەی عێراق.

دوای ئەوەی خەبەریان دامێ، منیش نامەیەکم نووسی بۆ کاک موخلیص خاوەنی نووسینگەی تەفسیر لە هەولێر، نوسخەیەکی کتێبەکەم بۆ نارد و داوام لێکرد کە چاپی بکات. پێم وت: مامۆستا هەولێر نە ناوەوە و نە دەرەوەی عێراقە، چونکە ئەو کاتە ئەمریکا بەشێک لە کوردستانی لە عێراق جوێ کردبووەوە و مەنعی حکومەتی عێراقی کردبوو کە تەدەخولی ئەو شوێنانە بکات، کە یەکێکیان هەولێر بوو.

ئەویش پیاوانە کتێبەکەی چاپ کرد و بڵاوی کردەوە.

# پێنج ساڵ لەخزمەت دکتۆر مستەفا زەڵمیدا

**ڕێدار ئەحمەد**
**چەند ڕاستییەک بۆ مێژوو**

بۆ پێنج ساڵ دەچێت لە لایەن وەزارەتی ئەوقافی هەرێمەوە لەگەڵ هاوکارم جمعە سدیق لەبری کاری فەرمانگە، لە خزمەت دکتۆر مستەفا زەڵمیدا کارد دەکەین. ئەم پێنج ساڵە بۆ من لە خوێندنی زانکۆ زۆر بەبایەختر بوو، چونکە بە ڕاستی وانەی کرداری لەم مرۆڤە سادە و مەزنەوە فێربووم. بە دەرفەتی دەزانم لێرەدا هەندێک ڕاستی تۆمار بکەم، بەو ئومێدەی سوودی بۆ هەموان تێدا بێت.
یەکەم: ئێمە چۆن بڕیارمان بۆ درا لەبری دەوامی فەرمانگە لای دکتۆر مستەفا زەڵمی دەوام بکەین و کارەکانی ئەو بەڕێوە ببەین؟
بۆ یەکەم جار کە لە نزیکەوە بە خزمەتی دکتۆر مستەفا زەڵمی گەیشتم، ئەو کاتە بوو کە کتێبێکی لەسەر جگەرەکێشان هێنابوو، وەزارەتی ژینگە چاپی کرد. دکتۆر داوای کرد لەسەر ئەرکی خۆیشی

هەزار دانەی دیکە چاپ بکرێت، کردمان. کاتێ کتێبەکەی بینی و سەیری کواڵێتی و نرخەکەی کرد، بە لایەوە زۆر هەرزان بوو. پێم وت من ئامادەم بۆ کتێبەکانی دیکەشت کاری سەرپەرشتیی چاپ بکەم. لێرەوە بیرۆکەی ئەوەم لا گەڵاڵە بوو کە ئەم زانا گەورەیە پێویستی بە کەسانێک هەیە لە بەردەستیدا کار بکەن، بیرم لەوە کردەوە دواتر ڕاژەکەم بگوازمەوە بۆ وەزارەتی ڕۆشنبیری، چونکە پەیوەندیدارە بەو کارەوە. بە داخەوە دکتۆر کاوە مەحمود، وەزیری ڕۆشنبیری، بەو داوایەم ڕازی نەبوو و ڕەتی کردوە، ئەمجا هەوڵم دا بیگوازمەوە بۆ وەزارەتی ئەوقاف، بە ڕێزەوە کاک کامل حاجی عەلی قبوڵی کرد و لە ڕۆژی ٢٠١٠/٤/١ لە خزمەت جەنابیدا دەستبەکار بووین، دەبێت هەوڵ و ڕێزی بەڕێوەبەری گشتی و بەڕێوەبەری ئەوقافی هەولێریش لەوەدا لە یاد نەکەین.

بۆچی ئەمەم نووسی؟ چونکە زۆر کەس پێیان وایە حکومەت لەسەر داوای خودی دکتۆر مستەفا زەڵمی دوو فەرمانبەری بۆ تەرخان کردووە، ڕاستییەکەی ئەوەیە کە ئەوە بیرۆکەی من بوو، کۆڵم نەدا، تا سوپاس بۆ خوا گەیشتمە ئاوات.

چۆنیەتی چاپکرانی کتێبەکانی؟

دکتۆر مستەفا زەڵمی لە مووچەی خانەنشینییەکەی نیوەی تەرخان کردبوو بۆ چاپی کتێبەکانی، گەلێ جار بەرپرسانی حکومی داوایان دەکرد هاوکاریی بکەن بۆ چاپکردنیان، بەڵام ئەو ڕازی نەدەبوو.

لە یەکەم ڕۆژی کارکردنمەوە خەونی ئەوەم هەبوو کۆبەرهەمەکانی لە یەک جانتادا بخەینە کتێبخانەی وڵاتانی ئیسلامییەوە، هێدی‌هێدی ئامادەکردنیانمان دەست پێ کرد، بەڵام پارەیەکی زیاتر لەوەی دەویست کە لە توانای خودی دکتۆر مستەفادا بێت، تا دواجار شاندی باڵای حکومەت بە نوێنەرایەتیی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی کە پێک هاتبوو لە بەڕێزان عیماد ئەحمەد جێگری سەرۆکی حکومەت و نەوزاد هادی پارێزگاری هەولێر و دکتۆر ئامانج ڕەحیم و توانا ئەحمەد ڕاوێژکارانی حکومەت هەمان داوایان کردەوە کە سەرۆکی حکومەت ئامادەیی هەموو کارێکی دەربڕیوە. دکتۆر مستەفا زەڵمی وەک پێشەی هەمیشەیی سوپاسی کردن و داوای هیچی نەکرد، من ئیجازەی قسەکردنم وەرگرت و باسی پرۆژەکەم بۆ کردن، زۆریان بە لاوە پەسەند بوو. بڕیار درا بخرێتە بواری جێبەجێکردنەوە و داوام لە جەنابی دکتۆر زەڵمی کرد کە ئەو کۆبەرهەمە کارێکی نایاب دەبێت بۆ زانایانی کورد لە کتێبخانەی وڵاتانی ئیسلامیدا، ئینجا ڕازی بوو.

ئەوە بوو لەسەر ئەرکی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان پەنجا کتێبی لە بیستوچوار بەرگدا بە یەکەوە چاپ کرا.
لە هەمان کاتدا دکتۆر ئەرسەلان بایز سەرۆکی پەرلەمان هەمان ئامادەیی نیشان دابوو و چوار کتێبیشی بۆ چاپ کردین کە مەنهەج بوو لە زانکۆکاندا و کرانە دیاری بۆ زانکۆ، لە کاتی سەردانیدا بۆ لای دکتۆر مستەفا زەڵمی داوای کرد بەرهەمەکانی بۆ چاپ بکەن، دکتۆر وەک پیشەی هەمیشەیی سوپاسی کرد و وتی خۆم چاپیان دەکەم، من لەوێشدا داوای مۆڵەتم لە دکتۆر کرد کە قسە بکەم، وەک ئەوەی سەرپەرشتی چاپی کتێبەکانی دەکەم، پێشنیازم کرد بۆ سەرۆکی پەرلەمان ئەرکی چاپکردنی یاداشتەکانی دکتۆر بگرێتە ئەستۆ، زۆر بە خۆشحاڵیەوە قبوڵی کرد. ئەمەشیان داوای دکتۆر مستەفا زەڵمی نەبوو، بۆ مێژوو دەیڵێم هەموو مامەڵەکانی پارەوەرگرتن و چاپ و هێنانەوەی لە لایەن منەوە بوو.

## ڕێزی دکتۆر مستەفا زەڵمی لای زانایانی جیهانی ئیسلامی

ساڵی ٢٠١٢ بە سەردانێک چووم بۆ وڵاتی تونس بۆ بەشداری لە دیدارێکی ئەدەبی. بە دەرفەتم زانی هەندێک لە کتێبەکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی لەگەڵ خۆم ببەم، ئەو کتێبانەی کە بردم، لەوێ بە هاوکاری ئەو ڕۆژنامەنووس و نووسەرانەی تونس کە دەمناسین، گەیاندمانە کەسایەتی و ناوەندە ڕۆشنیرییەکانی ئەو وڵاتە، لەوانە سەرۆکی ئەو کاتە و کتێبخانەی نیشتمانی و کتێبخانەی پەرلەمان و وەزیری ئەوقاف و دکتۆر ڕاشد غەنوشی و شیخ عەبدولفەتاح مۆرۆ و سەرۆکی زانکۆی زەیتونە.
دکتۆر عەبدولجەلیل سالم سەرۆکی زانکۆی زەیتونە زۆر ڕێزی لێ گرتین، کە کتێبەکانی بینی، گریا، وتی زۆر خەم دەخۆم کە زانای وا گەورەمان هەیە لە جیهانی ئیسلامیدا و ئێمە وەک کۆنترین زانکۆی جیهانی ئیسلامی نەمانناسیوە، ئاواتەخوازم بە خزمەتی بگەم. ئەم ئاواتەی هاتە دی و ساڵی ٢٠١٤ کە لە لایەن زانکۆی سەلاحەدینەوە بانگهێشت کرابوو بۆ کۆنگرەیەک، یەکسەر داوای کردبوو دەیەوێت بێتە خزمەت دکتۆر مستەفا زەڵمی. کە هات، سڵاو و ڕێزی خۆی و مامۆستایانی زەیتونەی بە دکتۆر زەڵمی گەیاند و ستایشی بەرهەمەکانی کرد.
کاتێ شێخی ئەزهەر ئاهەنگی ڕێزلێنانی بۆ دکتۆر مستەفا زەڵمی ئەنجام دا، دوای ئاهەنگەکە هەر لە شاری قاهیرە سەردانی نووسەری گەورەی عێراقی و جیهانی ئیسلامی دکتۆر تەها جابر عەلوانمان کرد، کە پێشتر لەئەمریکا دادەنیشت و سەرۆکی کۆڕبەندی جیهانی هزری ئیسلامی بوو. لە دیدارەکەدا وتی: دەبێت شێخی ئەزهەر هەست بە شانازی بکات کە ڕێزی لە تۆ ناوە، نەک تۆ شانازی بکەیت کە ڕێزت

لێ گیراوە. ئەم ڕستەیە واتا و مانای گەورەی هەیە، شێخ جەمال قوتبیش کە پێشتر موفتیی ئەزهەر بووە، لە هەمان سەردان‌دا بە خزمەتی گەیشتین. ئەویش هەمان قسەی کرد.

پێشتر لە هەولێر شێخ جەمال قوتب سەردانی دکتۆر مستەفا زەڵمیی کرد و داوای کرد لەسەر چوار بابەت بنووسێت، قەدەری خوای گەورە وابوو سێ بابەت لەو چوارەی کە شێخ جەمال داوای کرد دکتۆر زەڵمی لەسەریان بنووسێت، لەو کاتەدا لە چاپخانە بوون، واتە پیش داواکەی ئەو لەسەری نووسیبوون، ئەوانیش بابەتی کوشتنی هەڵگەڕاوە و ڕەجم و عەبد و جاریە بوو.
بە داخەوە تا کاتی نووسینی ئەم بابەتەش بەشێک لە مامۆستایانی ئایینیی کوردستان بە هەڵە لە قسەکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی تێگەیشتوون، نەهاتوون خوێندنەوەیەکی ورد بۆ کتێبەکانی بکەن تا بە جوانی لێی تێبگەن.
دکتۆر مستەفا زەڵمی موسوڵمانێکی دەوێت عەقڵی کراوە و کارا بێت، جگە لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەر -درودی خوای لیبێت- هەر نووسراوێکی هاتە بەردەست، سەیری ناوی نووسەرەکەی نەکات، بەڵکو سەیری ناوەڕۆکەکەی بکات، بە عەقڵێکی وردەوە بیخوێنێتەوە، گومان بکات کە ئەوە وایە یان وانییە، چونکە هەرکەس خوێندییەوە و گومانی نەکرد، ئەوا بە قووڵی نەیخوێندووەتەوە، ئەوەشی بە قووڵی نەیخوێندبووەوە، لە تێنەگەیشتندا دەمێنێتەوە.
کاروانی ژیانی دکتۆر مستەفا زەڵمی پێمان دەڵێت: ئەوەی کۆڵ نەدات دەگاتە ئامانج.
بۆمان دەسەلمێنێت زۆر جار کۆسپ و ناڕەحەتییەکان دواتر دەبنە خێر و بەرەکەت و خزمەتت دەکەن، وەک خۆی دەڵێت: ئەگەر لە زەڵم بەگەکان دەریان نەکردایە و لە سلێمانی مەلاکان دەریان نەکردایە، ئێستا ئەویش مامۆستایەکی ئایینی دەبوو لە مزگەوتێکدا، نەک زانایەک کە کتێبەکانی لە تەواوی زانکۆکانی عێراق لە کۆلێژی یاسا و لە زانکۆی چەند وڵاتێکی ئیسلامیدا مەنهەجن.

# بەندایەتی، سەرچاوەکانی چین و چۆن ئیسلام لەناوی بردن؟
# سەرچاوەکانی پەیدابوونی بەندایەتی (عبد و جاریە)

**دکتۆر مستەفا زەڵمی**

١- جەنگ: گەورەترین هۆی پەیدابوونی عبد و جاریە جەنگ بوو. هەر هۆزێک لەگەڵ هۆزێکی تر بکەوتایەتە جەنگەوە، یان هەر دەوڵەتێک لەگەڵ دەوڵەتێکی تر بجەنگایە، ئەوەی کە زاڵ ئەبوو بەسەر ئەوی تر، پیاوەکانی یان ئەکوشت یان ئەیکردن بە بەندە، ژن و کچەکانی ئەکرد بە جاریە، یان لە بازاڕ ئەیانفرۆشت یان ئەیانکردن بە خزمەتکار، کاری پێ دەکردن و لە هەمان کاتدا لەگەڵیاندا ڕای ئەبوارد، چونکە وەک ژنەکەی بوو بۆی. لەبەر ئەم هۆیە لە نێو عەرەبەکاندا باو بوو کە کچ زیندەبەچاڵ بکرێ، کاتێک کە گەورە ئەبوو، هەستی بکردایە کە ڕۆژێ لە ڕۆژان لە جەنگ بە دیل ئەگیرێ، زیندەبەچاڵی ئەکرد، خوای گەورەش دەفەرموویێت: **(وَإِذَا الْمَوْؤُودَةُ سُئِلَتْ بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ)** التکویر: 9-8. واتە هەر کاتێک کچی زیندەبەچاڵکراو

لە ڕۆژی قیامەت پرسیاری لێکرا بە چ تاوانێک زیندەبەچاڵ کراوە، تاوانکارەکەی هەست ئەکات بە تاوانەکەی و بەوەی کە شایانی ئەوەیە سزا بدرێت. هەروەها خوای گەورە دەفەرمووێت: **(وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنْثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ)** النحل: 58، واتە: هەر کاتێک بە یەکێک لە عەرەبەکان بوترایە ژنەکەت کچی بووە، دەموچاوی ڕەش و تاڵ ئەبوو لە خەفەت و ڕقخواردنەوەی خۆی، چونکە ئەیزانی پاشەڕۆژ ئەگەر هۆزەکەی کەوتە جەنگەوە لەگەڵ هەر هۆزێک و لاکەی تر زاڵ بوو، ئەم کچەی بە دیل ئەگیرێ و ئەکرێ بە جاریە، ئەم و ئەو ئەیکڕێ و ئەیفرۆشێ و ناموس و شەرەفی ئەو بە ناخی زەویدا دەبات.

هەر بەم بۆنەیەوە خوای گەورە لە بابەت دیلی جەنگەوە دەفەرمووێ **(فَإِمَّا مَنّاً بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء حَتَّى تَضَعَ الْحَرْبُ أَوْزَارَهَا)**، محمد: 4، واتە ئەگەر لە جەنگدا هەر کەسێک گیرا بەدیل، نێرینە یان مێیینە، لە پاش ئەوەی جەنگەکە تەواو دەبێت، دەبێ بەرەڵا بکرێت بەبێ بەرامبەر یان بەرامبەر بەو دیلانەی کە لایەکەی تر گرتوویانە یان بەرامبەر بە ماڵ و سامان یان شتی تر، وەکو پێغەمبەر (د. خ) بە دیلەکانی جەنگی بەدری ورت هەر کەسێ لە ئێوە دە منداڵی موسوڵمان فێری خوێندن و نووسین بکات، ئازاد دەبێت و بڕواتەوە شوێنی خۆی.

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

ئەم ئایەتە پیرۆزە **(فَإِمَّا مَنّاً بَعْدُ وَإِمَّا فِدَاء)** یەکەم ئایەتە لە قورئانی پیرۆز کە بڕیاری پاشەڕۆشی دیلەکانی جەنگی داوە، کە ئەوەش یەک شتە، بەرەڵاکردنیان، هەر بەم بۆنەیەوە پێغەمبەر (د. خ) لەگەڵ یارەکانی دیلەکانی جەنگیان نەدەکوشت و نەیاندەکردنە عەبد و جاریە، جگە لە جەنگی هۆزی بەنی مستەلەق، ئەویش لەبەر هۆیەکی تایبەتی بوو، لە پاشان هەموویانی ئازاد کرد.

بەڵام بە داخەوە، هەتا ئێستاش لە نێو عەرەبەکاندا عەبد و جاریە ماوە، بەتایبەتی دەوڵەتەکانی کەنداو. خەلیفەکانی ئیسلام لە پاش خەلیفەکانی ڕاشیدین هەموویان لە ماڵەوە بە لای کەمەوە سەد جاریەی جوانکیلەیان هەبوو بۆ خزمەت و ڕابواردن، زیاتر بە داخەوە ئیمامەکانی وەکو (ئەبو حەنیفە) و (مالیک) و (شافیعی) و مەزهەبەکانی تر، هەموویان ددانیان ناوە بە کردن و بوونی دیلی شەڕ بە عەبد و جاریە.

٢- ڕفاندن: هەروەکو چۆن دزی باوە، یەکێک ئەچێت ماڵی یەکێکی تر ئەدزێت، هەروەها هەندێ بووبوون بە جەردە و کوڕ و کچیان ئەڕفاند، کوڕەکە ئەبوو بە بەندە و کچەکە بە جاریە و ئەیانبردن لە بازاڕ ئەیانفرۆشتن.

خوای گەورەش ئەم کردەوەیەی حەرام کرد و قورسترین سزای بۆ دانان، وەک دەفەرمووێ: **(إِنَّمَا جَزَاء الَّذِينَ يُحَارِبُونَ اللّهَ وَرَسُولَهُ وَيَسْعَوْنَ فِي الأَرْضِ فَسَاداً أَن يُقَتَّلُواْ أَوْ يُصَلَّبُواْ أَوْ تُقَطَّعَ أَيْدِيهِمْ وَأَرْجُلُهُم مِّنْ خِلافٍ أَوْ يُنفَوْاْ مِنَ الأَرْضِ ذَلِكَ لَهُمْ خِزْيٌ فِي الدُّنْيَا وَلَهُمْ فِي الآخِرَةِ عَذَابٌ عَظِيمٌ)**، المائدة: 33.

٣- قەرزاری: هەر کاتێک قەرزارەکە نەیتوانیایە قەرزەکەی بداتەوە بە خاوەنی، بۆ خاوەن قەرزەکە هەبوو کە قەرزارەکە و ژن و منداڵەکانی بکات بە عەبد و جاریە و بیانبات لە بازاڕ بیانفرۆشێت، خوای گەورە ئەمەی حەرام کرد و لە قورئانی پیرۆزدا بڕیاری دا کە قەرزارێک ئەگەر نەیتوانی قەرزەکەی بداتەوە، ئەبێت خاوەن قەرزەکە چاوەڕوانی بکات تا ڕۆژێک بتوانێت ئەو قەرزە بداتەوە، ئەگەر هەر نەیتوانی هەتا مرد، پێویستە

میری له بیت المال (خەزێنەی گشتی) ئەو قەرزە بداتەوە ئەگەر خاوەن قەرزەکە زۆر پێویستی هەبوو بەو قەرزە، ئەگەر نا، ئازادی بکات و پاداشتی خۆی له خوای گەورە وەربگرێتەوە. قورئانی پیرۆز ئەفەرمووێت: **(وَإِن كَانَ ذُو عُسْرَةٍ فَنَظِرَةٌ إِلَى مَيْسَرَةٍ)** البقرة: 280، واته ئەگەر قەرزارەکە هەژار بوو و توانای نەبوو قەرزەکە بداتەوە، پێویستە لەسەر خاوەن قەرزەکە چاوەڕوانی بکات هەتا پاشەڕۆژ، وەکو باسمان له پێشەوە کرد. واته دروست نییە قەرزارێک نەتوانێ قەرزەکەی بداتەوە، هیچ سزا و ئازار بدرێت یان بخرێتە بەندیخانەوە یان هەر جۆرە سزایەکی تر.

٤- سزای تاوان: سزای هەندێک له تاوانەکان ئەوە بوو کە تاوانکارەکە بکرێ بە بەندە (عەبدو جاریە). له پێش ئیسلامدا له نێو هەندێ گەلدا باو بوو کە ئەگەر یەکێک پیاوێکی بە ناحەق بکوشتبایە یان دزی بکردایە، یان زینای بکردایە، سزاکەی ئەوە بوو کە دەکرا بە عەبد یان جاریە بۆ دەوڵەت، یان دەوڵەت یان بۆ تاوانلێکراوەکە یان بۆ میراتگرەکان له کاتی کوشتندا، خوای گەورە بۆ هەر یەکێ لەم گوناهانە سزایەکی تایبەتی دانا، لەبەر ئەوە دروست نییە تاوانکارەکە بکرێت بە عەبد یان جاریە.

٥- هەژاری: هەندێ جار مرۆڤی وا هەبوو لەبەر هەژاری خۆی ئەفرۆشت بە یەکێک بیکات بە بەندە ئەگەر نێر بوایە و بە جاریە ئەگەر مێینە بوایە؟ بۆ ئەوەی کڕیارەکەی بەخێوی بکات. بۆیە خوای گەورە کڕین و فرۆشتنی مرۆڤی حەرام کرد و فەرمووی **(وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ)** الإسراء: 70، واته: ڕێزی ئادەمیزادمان گرتووە و بایەخ و پایەیەکمان پێداوە کە شایەنی ئەوە نییە شتی ناڕەوا بەرامبەری بکرێت، یەکێک لەوانە کڕین و فرۆشتنیەتی.

٦- فرۆشتنی باوک بۆ منداڵەکانی خۆی: ماوەیەک له ژیانی ئادەمیزاددا باوک کردەوەی لەگەڵ منداڵی وەک کردەوەی وابوو لەگەڵ ماڵیدا. وەک چۆن ئەیتوانی ماڵەکەی بفرۆشێ، ئەیتوانی منداڵەکانیشی (کوڕ یان کچ) بفرۆشێت. دیارە فرۆشراوەکەش ئەو کاتە ئەبوو بە (عەبد و جاریە)، ئەمەش خوا حەرامی کرد وەکو له خاڵی پێنجەمدا باس کرا.

٧- منداڵی عەبد و جاریە وەکو باوک و دایک ئەوانیش بە عەبد و جاریە دائەنران. ئایینی ئیسلام ئەم ڕێگەیەشی بڕی کە فەرمووی هەر پیاوێک چووە لای جاریە و منداڵی بوو، ئەو منداڵە نابێ بە بەندە، بەڵکو ئازادە وەکو باوکەکەی.
زۆر هۆی تر هەبوو کە ئەم ڕژێمە بۆگەنەی لێ پەیدا ئەبوو، برا برای خۆی ئەکرد بە بەندە و خوشکی خۆی ئەکرد بە جاریە. هەروەکو لەم خاڵانەدا باسمان کرد، خوا ئەو هۆیانەی عەبد و جاریەی کە له پێش ئیسلامدا هەبوون، هەمووی لەناو برد و حەرامی کرد.
ئینجا بۆ نەمانی ئەم ڕژێمە بۆگەنە، ماوەیەکی دانا کە له یاسادا پێی ئەوترێ (فترة انتقالية). ئەو ماوەیەش بریتی بوو له سەدەی یەکەمی پاش

ئیسلام، کە ئەو جیلە تەواو ئەبن و عەبد و جاریە نامێنێت، لە پاش ئەوە ئیتر دروست نییە هیچ کەسێک بتوانێت یەکێک بتوانێت یەکێک بکات بە عەبد و جاریە.

بەڵام بۆچی بۆ یەکەم جار خوا ئەمەی حەرام نەکرد و نەیفەرموو هەرچی عەبد و جاریە یا ئازاد بن.

وەڵامی ئەم پرسیارە ئەمانەی خوارەوەیە:

یەکەم: کاتێک ئیسلام هات و ژمارەی عەبد و جاریە زۆرتر بوو لەوانەی کە پێیان ئەوترا (احرار و أسیاد)، ئەگەر ئیسلام بە یەکجار ئەمانەی ئازاد بکردایە، بە ملیۆنەها عەبد و جاریە کە لە ماڵی (سەیدەکان) ئەژیان بەبێ ئەوەی کە هۆیەکی ژیانیان هەبێت، ئەمە لە کاتێکدا لە (بیت المال)ی ئیسلام هیچی تیا نەبوو و نەیئەتوانی لە پاش ئازادکردنیان بەیەک جار ئەم هەموو عەبد و جاریەیە بەخێو بکات. ئەگەر ئیسلام ئازادی بکردایە بە یەکجار، هەموو ئەو عەبد و جاریەیە لە دژی بڕیاری ئیسلام ئەوەستا، چونکە هۆیەک نەبوو بۆ ژیانیان.

دووەم: لەو ڕۆژەی ئیسلام هات، زۆرترین شتێک کە بازرگانی پێوە ئەکرا و کڕین و فرۆشتنی لەسەر بوو، عەبد و جاریە بوو، لە مەککە و مەدینە بازاڕی تایبەتی هەبوو، کە عەبد و جاریەی تیا ئەفرۆشرا، پیاوی وا هەبوو هەزاران عەبد و جاریەی ڕاگرتبوو بۆ فرۆشتن بە قازانج.

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

ئەگەر ئیسلام بە یەکجار عەبد و جاریەی ئازاد بکردایە و کڕین و فرۆشتنی حەرام بکردایە، خاوەن عەبد و جاریەکان لە دژی ئاینی ئیسلام دەوەستان، جا لەبەر ئەوە ڕێگەی دانا بۆ لەناوبردنی ئەم ڕژێمە بۆگەنە و ماوەیەکی دانا بۆ نەمانی، ئەویش کە بریتییە لە سەدەی یەکەمی پاش ئیسلام.

سێیەم: هەندێ کەس هەیە بەندایەتی ئەبێتە خوو بۆی، هەر پێی خۆشە خزمەتکار بێت و ژێردەستە بێت، هەروەکو لە وڵاتی کوردەواری هەندێ کەس خزمەتکاری ماڵی ئاغا و ماڵە شێخەکان، ئەو خزمەتکارییەی نەئەگۆڕییەوە بە هیچ ژیانێکی تری باشتر، ئەگەر ئیسلام ئەم ڕژێمەی بە یەکجار لاببردایە، زۆر لە بەندەکان لە دژی ئیسلام ئەوەستان و مانەوەیان بە بەندایەتی لە لا باشتر ئەبوو.

بۆ نموونە (ئەبراهام لینکۆڵن) سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، کاتێک بۆ یەکەم جار یاسای دەرکرد بۆ ئازادکردنی عەبد و جاریە و قەدەغەکردنی کڕین و فرۆشتنیان، زۆر لەو جاریە و عەبدانە لە دژی یاساکە وەستان و لێیان هاتەوە بۆ ماڵی سەیدەکان و پێی باشتر بوو، ئینجا لەبەر ئەمە ئیسلام ماوەیەکی دوورودرێژی دانا، کە زیاتر نەبێت لە سەد ساڵ بۆ لەناوبردنی ئەم ڕژێمە بۆگەنە.

لەمەدا بۆمان دەردەکەوێت کە ئیسلام هیچ کات ددانی بەوەدا نەناوە کە مرۆڤ برای خۆی بکاتە بەندە، خوشکی خۆی بکات بە جاریە و بەبێ مارەکردن بچێتە لای، بەڵکو وەکو باسمان کرد، ئیسلام ئەم ڕژێمەی وەکو گۆمەئاوێکی بۆگەن پیشان داوە، لە چەند جۆگەیەکەوە ئاو ئەهات بۆ ئەم گۆمە، ئەم جۆگەلانەی وشک کرد و لە ئەنجامدا گۆمەکەش بۆ هەتاهەتایە وشک بوو.

ئەو مامۆستایانەی ئاینی ئیسلام وەک عەبدولکەریم زێدان و یەکێکی تر ئەگەر بە وردی لەم بابەتە ورد ببوونایەتەوە و بچوونایە ناوجەرگەی کارەکەوە، ئەیانزانی خوای گەورە هیچ وەخت ئەم کردەوە پەسەند ناکات، چونکە کردەوەیەک بۆ بەندە ناشیرین بێت، چۆن خوا بڕیاری چاکەی ئەدات.

ئێستا ساڵی 2001، سەدەی 21، (191) دەوڵەت ئەندامی نەتەوە یەکگرتووەکانن، هەریەک لەم دەوڵەتانە کڕین و فرۆشتنی عەبد و جاریەیان پێ تاوانی گەورەیە، کەوابوو، چۆن مرۆڤ بڕیار ئەدا کە خوای گەورە ئەم تاوانە ناهەموارە بە شتێکی دروست و باش بزانێت بۆ ئادەمیزاد.
جگە لەوەی کە باسمان کرد، بە سەدان ئایەتی پیرۆز هەن لە قورئانی پیرۆزدا هەمووی دژی بەندایەتین، هەندێ لەوانە وەکو **(إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ)**، الحجرات: 13، واتە بەڕێزترینی کەس لای خودا ئەو کەسەیە کە لە خوا نزیک بێت و سوودی بۆ ئادەمیزاد هەبێت.
هەروەها هەموو ڕۆژێک چەند جار لە نوێژدا دەڵێین (إیاك نعبد)، واتە بەندایەتی تەنها بۆ تۆیە، هیچ کەسی تر شایەتی ئەوە نییە ببێ بە کۆیلە و ملی بۆ کەچ بکات.
بەڵام بە داخەوە، لە پاش خەلیفەکانی ڕاشیدین، خەلیفەکانی ئیسلام جگە لە عمر بن عبدالعزیز، هەر خەلیفەیەک بە لای کەمەوە سەد جاریەی جوانی لە ماڵەکەیدا ڕائەگرت و هەریەکە لە لای حەلاڵ بوو وەکو ژنەکەی، بە درێژایی ساڵ لەگەڵ ئەمانە ڕای ئەبوارد و سەماو گۆرانییان ئەوت و موسوڵمانەکانیان لە هەموو زانایی و شارستانیەت و پێشکەوتنێک دواخست.
بۆ نموونە کاتێک کە ئەمەریکا هێشتا نەدۆزرابووەوە، گەلەکانی ئەم وڵاتە وەکو ئاژەڵ ئەژیان، یاساکەیان یاسای ئاژەڵی دڕندە بوو، لە کاتێکدا ئاڵای ئیسلام لەسەر چواریەکی ئەرز ئەشەکایەوە، هەمووی لەژێر دەسەڵاتی ئیسلام بوو، یەکێ لەو وڵاتە گەورانە ئەندەلوس بوو، ئێستا پێی دەڵێن ئیسپانیا، یەکێک لە نموونەکانی ئەمڕۆ بۆ دواکەوتنی موسوڵمانەکان ئەوەیە کە ملیارێک موسوڵمان و 300 ملیۆن عەرەب گیری خواردووە بە دەست سێ ملیۆن جوولەکەوە و سەرۆکی وڵاتە عەرەبییەکان وڵات وڵات ئەگەڕێن دەست و قاچی سەرۆکی دەوڵەتەکانی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا ماچ ئەکەن بۆ ئەوەی جوولەکە لەگەڵ گەلە لێقەوماوەکەی فەلەستین ڕێک بکەوێت و دەستدرێژی نەکات، ئەم گەلە بەدبەختە کە پەنجا ساڵە دەربەدەر و شاربەشار بووە و لە شێواوی و کوشتن و ستەمدا ئەژی و لەوان بەدبەختتر مەگەر هەر گەلی کورد بێت.
ئینجا با بگەڕێینەوە سەر دکتۆراکەی حوسێن نەدا، بە عەمیدی کۆلێجی یاسای زانکۆی بەغدام وت من یان لە ئیشراف ئەچمە دەرەوە، یان بایەخی ئەم نامەی دکتۆرایە لەوەیە کە باسی بەشی عەبد و جاریەی تێدا بێت، کە ڕوونی کردووەتەوە لای خوا عەبد و جاریە نییە، هەموو ئادەمیزاد وەک یەک وانە، تەنیا بە چاکەکردن جیاوازییان هەیە، هەروەک پێغەمبەری خوا فەرموویەتی: (الناس سواسیە کأسنان المشط) واتە هەموو ئادەمیزاد لە ڕێز و نرخدا وەکو ددانی شانە وان، چۆن زیاد و کەمی نییە، ئەوانیش هەر وان.
ئینجا ڕاگرەکە بڕیاری دا کە هیچ بایەخ نەدرێ بە بڕیارەکەی مامۆستا عەبدولکەریم زێدان و لیژنەیان تەئکید کرد و دکتۆرامان دا بە حوسێن نەدا بەبێ ئەوەی بەشەکە لابرێت لە نامەکە.

# مستەفا زەڵمی:
# گوڵبژێرێك لە كتێبی كاروانی ژیانم

**١**

**ساباڵغ (مهاباد): ئەیلولی** 1942

بە ڕاستی یەکێکە لە جوانترین شارەکانی کوردستان، شارێکی پاک و پوخت بوو، دانیشتوانەکەی زۆر بەڕێز و کوردپەروەر بوون، تازە بنچینەی کۆمەڵەی ژیانەوەی کوردستان و دەوڵەتی کوردی (کۆماری مهاباد) دەستی پێ کردبوو، ئەو دەوڵەتەی خوالێخۆشبوو (قازی محەمەد) بوو بە سەرۆکی، ئەو دەوڵەتەی کە ئینگلیز و ڕووس بەڵێنیان دایە کە پشتی بگرن، لە دواییدا پەشیمان بوونەوە و لەگەڵ کوڕەکەی ڕەزا شا (محەمەد پەهلەوی) ڕێک کەوتن و ئیمتیازی دەرهێنانی نەوتی ئێرانی پێدان.
هەر لەو کاتەدا بە سەردان چووم بۆ ماڵی خوالێخۆشبوو شەهیدی کوردپەروەر (قازی محەمەد)، ماڵەکەیان لەسەر تەپۆڵکەیەکی بەرز بوو، لەوێ کانیاوێکی تیا بوو، ئاوەکە بە لای ماڵەکەیدا دەهاتە خوارەوە و لە خواری ماڵەکەیان ئاوێکی زۆر هەبوو و وەک ڕووبار وابوو، درەخت و قامیشێکی زۆری تیا بوو.
لەو سەردەمەدا شاری مەهاباد جوانترین شاری کوردستان بوو، ماڵی پێشەوایش جوانترین شوێن بوو

له مەهاباد، خاوەنەکەیشی جوانترین پیاو بوو له مەردایەتیدا.
جگه لەو جاره، تا له دێی بوکرێ ئەمخوێند له مەنگوڕ، (1943–1942) چوار جاری تر چووم بۆ زیارەتی بۆ ماڵەوە.
ئەو وەختەی من لەوێ بووم، هیچ شارێک هێندەی مهاباد مەلای گەوره و بەناوبانگ و زانای بەرزی تیا نەبوو، لەوانەی که له بیرمن (مامۆستا مەلا محەمەدی ڕەش) و (مامۆستا مەلا محەمەدی بزنیانی) و (مامۆستا مەلا صدیقی مزگەوتی ناوبازاڕ)، هەمووشیان له بیروباوەڕی نەتەوایەتییان سوودیان له پێشەوا وەرگرتبوو، بەتایبەتی ئەیانوت مامۆستا مەلا صدیق له مزگەوتی بازاڕ هەموو هەفتەیەک وتارێکی کۆمەڵایەتیی هەبوو له پاش نوێژی هەینی و زۆرترین پیاوانی شارەکه کۆ ئەبوونەوه و گوێیان بۆ ئەگرت، ڕێگەی دانیشتن نەبوو. بەڵام به داخەوه هیچ مەدرەسەیەکی ئایینی نەمابوو له شارەکەدا، ناوی فەقێیەتی تیا سڕابووەوە.

## ٣

مەلا و گاوان (شکارته):
ئیسماعیل ئاغا پێی وتم: هەموو ساڵێک بۆ مەلای گوند گەلەجووتمان کردووه، هەندێ گەنممان بۆ وەشاندووه، ئەگەر تۆش ئارەزوو دەکەیت، با ئەمساڵ گەلەجووتێکت بۆ بکەین، وتم: ئاغا دیاره بەرهەمی گەلەجووتەکه گەلێ حەڵاڵتره بۆ من له سەرفیتره و زەکات، چونکه ئەم دوانه بۆ هەژار و لێقەوماو دانراون، بۆ مەلایەک که پێشەوای موسوڵمانان بێت، گەلێک ناڕەوایه.
شایەنی باسه گەلەجووت چۆن دەکرا بۆ مەلا، هەروا دەکرا بۆ گاوانی دێیەکه. وا ڕێک کەوت له یەک ڕۆژدا جووتەکانی ئاوایی کران به دوو بەشەوه، بەشێک بۆ مەلا و بەشێک بۆ گاوان، هەروەها وا ڕێک کەوت ئەو دوو زەوییەی که بۆ مەلا و گاوان دیاری کران، له تەنیشت یەکتردا بوون، هیچ زەوییەک له نێوانیاندا نەبوو، ئەو ڕۆژەی که گەلەجووت بۆ من و گاوان کرا، ڕەشەبایەکی زۆر توند هەڵیکرد، لەبەر تۆزوخۆڵ چاو چاوی نەئەبینی، من خۆم لەوێ بووم که گەلەجوتەکه کرا، بەڵام لەبەر ڕەشەباکه دواتر نەمزانی کام پارچه زەوییه هیی منه و کامیان هیی گاوانه.
له زەوییەکانی ئەو ناوچەیەدا مشکێکی بێشومار هەبوو، کشتوکاڵ که سەوز دەبوو و بەرزیی ئەبوو به نیومەتر، هەموو ڕۆژێک ئەبوو مشکی ناو دەغڵەکه بکوژێت.
لەبەر ئەوەی که سێشەممه و هەینی پشوو بوو له نێو فەقێیەکاندا و دەرس نەبوو، من هەموو فەقێکانم دەبرد بۆ مشککوشتن. بەڵام یەکەم جار که ڕۆیشتین، لێم تێک چوو دەچووم له زەویی گاوان مشکم دەکوشت، گاوانیش ئەمە دەزانێت، بەڵام دەنگ ناکات، هەموو جارێک که ئەچوومه سەر زەوییەکه، لەبەر خۆمەوه توانجم ئەدا له گاوان، ئەمە تا دوو مانگ بەردەوام بوو، ئەو زەوییەی تر هەمووی مشک خواردی و زەوییەکه به سووری مایەوه، له پاشا که گەنمەکەی تر له دەستی مشک دەرباز بوو و گوڵی کرد، گاوانی نامەرد به ئیسماعیل ئاغا دەڵێ: مامۆستا لێی تێک چووه مشکی گەنمەکەی منی کوشتووه لەجیاتیی مشکی گەنمەکەی خۆی، ئیسماعیل ئاغا به منی وت ئەمه ڕاسته، منیش دەستم کرد به قسه وتن به گاوان، وتم: درۆ دەکات من مشکی گەنمی خۆمم کوشتووه، ئاغا فەرمانی دا دوو ئەسپیان هێنا یەکێ بۆ من و یەکێک بۆ کوێخا باییز، پێکەوه چوین بۆ سەر زەوییەکه، کوێخا باییز وتی: مامۆستا ئەو گەنمەی که مشک خواردوویەتی، گەنمەکەی تۆیه. منیش که هاتمەوه، دانیشتم پارچه شیعرێکم نووسی بۆ مەلای پێشووی دێکه (مەلا سەعدی) که له داخان دێکەی بەجێ هێشتبوو چووبوو له (قەڵادزێ) دووکانی دانابوو، به داخەوه جگه لەم چەند دێڕه نەبێت، هەندێ له شیعرەکانم له بیر نەماوە:

ئاغا وتی:
ئەی مامۆستای بێباوان
هەی زانیاری بێتاوان
بۆ چوویتە ڕیزی گاوان
من بۆت ئەکەم بە چاوان
هەرچیت بویێ لە گاوان

گاوان ئەڵێت:
هەر لە ڕۆژی (قالوا بلی)
بڕیار درا لە بۆ مەلا
سەرفیترە و موچەی فەلا
خێر و خێرات دفع البلا
بۆچی لاتدا هەی مام مەلا
لەم ڕێ ڕاستەی پڕ لابەلا
مەلا هەروا بەختی کۆمە
سەری باران ژێری گۆمە
من بۆ حاڵی ڕۆڵەڕۆمە
مشکت کوشتووە بەختی خۆمە

مەلا وتی:
گاوان پوختی نییە بەختی هەیە
تەختەی نییە تەختی هەیە
بێقەوارە زەختی هەیە
بۆ مافی خۆی جەختی هەیە

بەڵێ ئەو گاوانی ناوە
بەڵام ئیشی لەبەر چاوە
ئەوەی کە پێی سپێرراوە
بێمنەتە و لای تەواوە

من نایکوتم چونکە جەوتە
بۆ هەندێ تر بە ڕێکەوتە
پەسەند ئەبێ ئەوەی چەوتە
وا مەزانە بەپێی ڕەوتە

بەڵێ گاوان بەختی یارە
دوور لە غەمی کێشەی کارە
مەلا نییە لێی تێنەگەن
بۆ ناسینی زوو پێ نەگەن

دیارە ئەوەی غەمی سەختە
ئاڵۆزییە و ڕەشیی بەختە
کە هۆی ژینت ئەو کەڵکە بێ
کە لە قووتی ئەو خەڵکە بێ

زۆربەش هەژار و فەقیر بن
لێت تێنەگەن پێت زویر بن
کە ژینی تۆ چاتر نەبوو
غەمی ئەوان زیاتر نەبوو

مەلاش هەیە بێ قەزابێ
بۆ ئەوەی جێگەی ڕەزا بێ
چاوی لە چەوتی ئەپۆشێ
ئاوی جیاوازیی ئەنۆشێ

بۆیە ئەوەی لەسەر حەقە
ئەو ژیانەی زۆر پێ لەقە

**٣**

بۆ یەکەم جار تەختەڕەش لە مزگەوتدا:
ڕۆژێک بە فەقێکانی شارم وت: هەمیشە مامۆستاکانی مەعاریف ڕەخنەمان لێ دەگرن، چونکە ئێمە حیساب و جەبر و فیزیا و کیمیا نازانین، هەرچەندە خوێندنی ئێمە زیاتر و قورسترە لە هیی ئەوان، لەبەر ئەوە ڕۆژانی سێشەممە و جومعە لە مزگەوتەکەم ئەو وانانە دەڵێمەوە، کێ دەیەوێت بێت.
ئینجا تەختەیەکی ڕەشم لە مزگەوت هەڵواسی، کە ئەمە یەکەم جار بوو لە کوردستاندا شتی وا ڕوو بدات -وەکو من بزانم-، هەموو خەڵکی گەڕەکەکە

دەهاتن و سەیریان دەکرد و سەرسام مابوون.
فەقێکانی شاری سلێمانی بە سوختە و موستەعیدەوە بۆ ماوەی دوو مانگ، هەر هەفتەیەک دوو ڕۆژ، سێشەمە و جومعە، لە بەیانییەوە دەهاتن بۆ مزگەوتەکەم (مزگەوتی بن تەبەق) لەسەر فەرشەکان ڕیز لە دوای ڕیز دادەنیشتن و ڕوویان ئەکردە ئەو سەبورەیەی بە دیوارەکەدا هەڵواسیبوو، منیش لە بەردەمیاندا ڕادەوەستام و دەرسی حساب و جەبر و هەندەسە و جوگرافیا و دەرسەکانی تری مەکتەب کە فێری بووبووم، پێم دەوتن، هەر شتێک پێویستی بە نووسین بکردایە، بە تەباشیر لەسەر تەختە ڕەشەکە بۆم دەنووسین.
من بۆیە ئەمە هات بە مێشکمدا –لەوەوپێش باسم کرد– کە زۆر زانای گەورە لە کورد هەڵکەوت وەک قزڵجی، پێنجوێنی، قەرەداغی، مەلای نۆدشە، مەلا قادری گەورەی بیارە، سەدانی تر کە هەر یەکێک کەمتر نەبوو لە ئیمامەکانی ئیسلام وەک (رافعی و ڕەمەلی) لە شافعییەکان، کاسانی و حەسکەفی و إبن الهمام لە حەنەفییەکان، أشهب و سحنون و مصعب لە مالکییەکان و إبن تیمیە و إبن قیم لە حەنبەلییەکان. لەگەڵ ئەوەشدا هیچ بەرهەمێکیان بەجێ نەهێشت، چونکە هەموو ژیانیان بەسەر چەند فەقێیەکدا دابەش بوو کە هەر ڕۆژە یەک دەرسی دەوتەوە بەو فەقێیە و هەریەکە (مەنهەجێکی) جیاوازی هەبوو.
ئینجا ئەو فەقێیە کە بەو جۆرە پێ دەگەیشت، چەند وشەیەکی لە حاشیەوە فێر دەبوو، دەیکرد بە فیز و فشە بەسەر ئەوانی تردا کە نەیاندەزانی، تەنها لەو کتێبەدا دەیزانی بخوێنێتەوە، چونکە بە مەرەکەبی سوور سەر و بۆری دەکرد، ئەگەر لەباتی هەمان

(کتێب) کتێبێکی ترت بۆ بهێنایە، نەیدەزانی بە دەرس بیڵێتەوە، هەتا دوێنێش خەتیبەکانی مزگەوتەکان (إبن نباته)یان ئەخوێندەوە، کە بریتییە لە (40) خوتبە و هەریەکە لە جومعەیەکدا بۆ ساڵێک، چونکە لە ساڵێکدا (40) هەینی هەیە. وەک جارێکی تریش وتم، مامۆستاکان ئەوەندەی کتێبی لاوەکییان دەخوێندەوە، ئەوەندە قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەریان (د. خ) نەئەزانی.

٤

چۆن بووم بە ئەندامی ئەفسەرە ئازادیخوازەکان

لە پێش چوونمان بۆ ئوردن، بۆ ماوەی مانگێک لە(H3) ماینەوە، عەبدولسەلام عارف سێ خێمەی گەورەی لێک دا و مزگەوتێکی سەفەریی لێ پێک هێنا. بە منی وت بەرنوێژیمان بۆ بکە و جومعەشمان بۆ بکە. یەکەم جومعە زۆر لە ئەفسەرەکانی لیواکە هاتبوون بۆ نوێژ، منیش بەبێ ئەوەی بترسم لە پاشەڕۆژ، خوتبەیەکی ئایینی و سیاسیم خوێندەوە، چونکە ئەو کاتە تا حەدێک ڕێگەی قسەکردن هەبوو، لە وتارەکەمدا هێرشم کردە سەر ئەفسەرەکان و وتم: ئێوە لەبەر بەرژەوەندیی خۆتان بیر لە بەرژەوەندی عێراق ناکەنەوە و بیر لەوە ناکەنەوە وڵاتەکەتان ڕزگار بکەن لە دەست داگیرکەر. بەم جۆرە خوتبەکەم لەسەر ئەو باسە بوو.

شەو کاتژمێر 10، عەبدولسەلام ناردی بە شوێنمدا، گومانم کرد لێپرسینەوەم لەگەڵ بکات لەسەر وتارەکەم، کاتێ چوومە ناو خێمەکەیەوە، مێزێکی لە بەردەمدا بوو، قورئانێکی لەسەر بوو، ئاماژەی بۆ کرد و پرسی: ئەوە چییە لەسەر ئەو مێزە؟

وتم: قورئانە.

وتی: لەبەر ئەوەی متمانەم پێت هەیە، سوێندت نادەم، بەڵام لە ئەمڕۆوە وا دابنێ ئەندامێکی ئەفسەرە ئازادیخوازەکانیت.

وتم: شانازی دەکەم بەوەی پەیوەندی بکەم بە ئێوەوە، بەڵام دەبێت بزانم ئێوە ئامانجتان چییە و ئەرکی سەر شانی من چییە؟

وتی: ئامانجی ئێمە ئەوەیە کە ڕژێمی پاشایەتی بگۆڕین بۆ کۆماری و حکومەتێکی ئیسلامی پێک بهێنین کە جیاوازی نەبێت لە نێوان کورد و عەرەبدا، ئەرکی تۆ لای ئێمە ئەوەیە کە تۆ بە هۆی ئەوەی جبە و عەمامەت لە بەردایە، کەس گومانت لێ ناکات، کاتێ نامە یان کتێبێکی نهێنیمان بۆ دێت، تۆ بەسەر ئەفسەرە ئازادیخوازەکاندا دابەشی بکە، منیش داواکەیم قبوڵ کرد، چونکە ئەوە ئامانجی هەموو موسوڵمانێکی پاک و نیشتمانپەروەرە، بەڵام بە داخەوە ئەوەی کە وتی، پاش ئەوەی کە گەیشتە سەر کورسیی دەسەڵات، هەمووی بە پێچەوانەوە جێبەجێ کرد، یەکەم دوو ئیشی گەورەی بۆ خۆی هەڵبژاردبوو، بوو بە نائیبی قائدی قواتی مسەلەحە، هەوڵی دا عێراق بکات بە هێلکەیەکی پاککراو و بیخاتە دەمی میسرییەکانەوە، عێراقی وا تێک دا، کە ئێستاش بە دەست ئەنجامەکانی ئەو تێکدانەوە ئەناڵێنێ، دەرکەوت ئەگەر پێغەمبەر (د. خ) عەرەب نەبوایە، ئەو ئیمانی پێ نەدەهێنا، زۆر ئیشی ڕەگەزپەرستانەی کرد، بۆ یەکەم جار ویستی کوردەکان بخەڵەتێنێ و بانگی کردن بۆ برایەتی و پێی ئەوتن (یا ابناء محمد)، لە پاشان زۆر پیاوماقوڵی کوردی زیندانی کرد، جارێکیان لە کولیەی عەسکەری کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ ئەفسەرەکاندا کرد، منیش ئامادە بووم تێیدا، وتی: دەست ئەخەمە ناو دەستی شەیتان بۆ لەناوبردنی

EKDuncan aka EveyD.deviantart.com

مستەفا نەریمان

بطاقة جواز الاشتراك في الامتحانات العامة

١٩٦٠ - ١٩٦١

الدراسة الاعدادية ـ الفرع الأدبي

الاسم واسم الاب واللقب

الرقم الامتحاني ١٠/١٠٧

المدرسة ثانوية نقابة المعلمين المسائية في جانب الرصافة

اللــــواء

ناجح في المعدلات السنوية اكمال

التاريخ

للصف الثاني الاعدادي (الخامس الثانوي) مدير

الجمهورية العراقية ٥٠ طابع مالي

١٩٦١/٦/١



دوژمنانی عەرەب (مەبەستی کورد بوو)، هەروەها وتی ئاخر بستی لوتکەی شاخەکانی شیمالی عێراق هیی عەرەبە.

ئەفسەرێکی گەورە کە جێگەی بڕوا بوو، وتی: عەبدولسەلام عارف ئەفسەرە گەورەکانی لە شوێنێکی نهێنیدا کۆ کردەوە و منیشیان (واتە ئەو کەسەی کە بۆی گێڕامەوە) لەگەڵدا بووم، وتی: ئەمەوێت کیمیاوی بکەم بەسەر ئەو شاخانەدا کە کوردە چەکدارەکانی تێدایە.

ئەفسەرەکە وتی یەکێک لە بەشداربووانی کۆبوونەوەکە پێی وت: ئەگەر کیمیاوییەکە بکەین بەسەر شاخەکاندا، هەندێکی ئەچێتە خاکی ئێرانەوە و ئەو کاتە ئێران لە نەتەوە یەکگرتووەکان شکاتمان لێ دەکات، ئەگەر بکرێت بە بنی شاخەکانیشدا، ئەوا زۆر لە ژن و منالّی بێتاوان ئەکوژرێن، عەبدولسەلام وتی: من لە هەردوو لاوە کیمیاوییان بەسەردا ئەکەم، با ئێران هەر شکاتی خۆی بکات، ئەو منالّانەشی کە کیمیاویی ئێمە ئەیانکوژێت، ئەگەر بمێنن و سبەی گەورە ببن، ئەوانیش دەبنە موتەمەرید.

ئەمە نموونەیەکە لەو ئامانجانەی کە هەیبوو، بە پێچەوانەی بەڵێنەکانیەوە کە توانیی چەند کەسێکی وەکو منی پێ بخەڵەتێنێت.

بەم شێوەیە بوومە یەکێک ئەفسەرە ئازادیخوازەکان.

## ٥

دەستکەوتی زیاتر لە (17) ساڵ لە برادەرایەتی بە داخەوە (17) ساڵ و (20) ڕۆژ لە تەمەنی خۆم لە سوپای عێراقدا بەسەر برد، بە سەدان برادەرم هەبوو لە ئەفسەر و جێگری ئەفسەر و عەریف و نائیب عەریف و سەرباز، بەڵام ئەوانەی برادەری ڕاستەقینەیان لەگەڵم بەست، تەنها (3) کەس بوون، یەکێک موسوڵمان و یەکێک مەسیحی و یەکێک (صابئی)، واتە ڕاستی لە ناو ناموسوڵمانەکاندا، دوو ئەوەندەی موسوڵمانەکان بوو، چونکە

لەم ماوە زۆرەدا یەک موسوڵمانم بە ڕاستی بینی کە بەوەفا بێت و متمانەی پێ بکرێت، برادەرییەکەی لە کانگای دڵەوە بێت، کەچی دوو ناموسوڵمانم پەیدا کرد، یەکێکیان دکتۆر فەهمی جەزراوی بوو، کە لەمەوپێش باسم کرد، ئەمە بە پلەی (لیوا) پزیشک بوو لە سوپادا، پسپۆڕی نەخۆشیی سیل بوو، هەر نەخۆشێکم ئەبردە لای، بانگی ئەکردمە دەرەوە و سوێندی ئەدام کە تا چ ڕاددەیەک دەسەڵاتی هەیە، واتە نەخۆشەکە هەژارە یان نا، ئەگەر بموتایە هەژارە، پارەی بینینی نەخۆشەکەی لێ نەئەسەند، ئەو دەرمانانەی بۆی ئەنووسی، خۆی پێی ئەدا.

**بەغدا، قەسری نیهایە ١٩٦٣/١١/١٨**

دووەم برادەری ناموسوڵمانم کە (د. ئەسعەد ناسر) بوو، (صابئی) بوو. ئەم پزیشکە کاتێک گوێزرایەوە بۆ ئەو شوێنەی منی تیادا بووم لە بەغدا لە کۆشکی ناوبراو، دوو ڕۆژ بوو هاتبوو، ڕۆژی سێیەم من پێم ڕاگەیەنرا کە گوێزراومەتەوە بۆ ئوردون، کاتێک کە سوپای عێراق لەوێ بوو، ئەو ئیمامەی لەوێ بوو، گوێزرابووەوە بۆ جێگەکەی من، منیش ئەو ساڵە -کە ساڵی (1967) بوو- لە ماجستێری (شەریعە) وەرگیرابووم، ئەگەر بڕۆشتمایە بۆ ئوردون، ئەو خوێندنەم لە کیس ئەچوو، (د. ئەحمەد سبتی) کە ئامری نەخۆشخانەکە بوو، وتی: من هەوڵ ئەدەم کە گواستنەوەکە بەتاڵ بکەمەوە. د. ئەسعەد وتی: ئەگەر ئەم گواستنەوەیەی تۆ بەتاڵ بکرێتەوە، من نان و کەباب بۆ هەموو ئەفسەرەکان و بەڕێوەبەرەکانی ئەم نەخۆشخانەیە ئەکرم.

ئەم پیاوە دوو ڕۆژ بوو منی بینیبوو، تەنها سەلاممان لە یەکتر دەکرد، بەو دوو ڕۆژە بوو بە برادەرێک، کە لە برای دایک و باوک دڵسۆزتر بوو.

د. ئەحمەد سبتی ڕۆیشت بۆ لای (رئیس أركان الجیش)، گواستنەوەکەی منی بەتاڵ کردەوە، پاشان د. ئەسعەد ناردی نان و کەبابیان هێنا، کە بەشی زیاتر لە (100) کەسی ئەکرد، هەر لەو ڕۆژەوە تا ئێستا ئەو پیاوە بە ڕاستی بووەتە برادەر، هەموو جار یەکتر ئەبینین، ئەڵێ: "تۆ قیبلەی ژیانی منی"، ئەم ڕاستگۆییەی تەنها بەرامبەر بە من نەبوو، بەڵکو هەرکەسی خۆش بویستایە، بە ڕاستی ئەیوت من تۆم خۆش ئەوێت، ئەوەشی نەیوستایە، بە ڕاستی ئەیوت ڕووبەڕوو من برادەری لەگەڵ هەموو کەس ناکەم، ئەگەر یەکێک ڕاست بوایە، ڕووبەڕوو ئەیوت تۆ ڕاستی، هەروەها ئەگەر چەوت بوایە، ئەیوت تۆ چەوتیت.

پێش چەند ساڵێک تاقمەددانێکی بۆ کردم، چونکە پزیشکی ددان بوو، تا ئێستاش هیچ کەس هەستی بەوە نەکردووە کە ئەمانە ددانی دروستکراون، هەموو کەس ئەڵێت: تۆ تەمەنت زۆرە کەچی ددانەکانت بە ساغی ماونەتەوە.

باوکی ئەم پزیشکە هەرچەند موسوڵمان نەبوو، بەڵام ڕەوشتی گەلێک جوان و ڕاست بوو، بە ڕاستی خۆی موسوڵمان نەبوو، بەڵام وتن و کردەوەی هیی پیاوی موسوڵمانی ڕاستەقینە بوو، لە پێش مردنیدا بە (3) ڕۆژ بە د. ئەسعەدی وتبوو لەم نزیکەدا ماڵئاواییتان لێ دەکەم، کوڕێکی تریشی ئەبێت ئەفسەر ئەبێت لە سوپادا. د. ئەسعەدیش بە باوکی وتبوو با بچم بۆ بەسرە

براکەم بهێنمەوە تا ببیبینێت، پێی وتبوو پێویست ناکات، من نامرم هەتا ئەو ئەبینم، د. ئەسعەد ئەڵێت: براکەم هاتەوە، لە پاش دیتنی ئەو بە یەک کاتژمێر کۆچی دوایی کرد.
ئینجا ئێمە بیروباوڕەمان ئەمەیە کە تەنیا موسوڵمان پیاوی چاکە و بەهەشت هەر بۆ ئەو دروست کراوە، بەڵام تەنیا خوا خۆی ئەو حسابانە ئەزانێت، هەر خۆی ئەزانێ لە چ بەندەیەک ڕازییە و چ کەسێک ئەو لێی ڕازی نییە.
سێیەم کەس برادەرە موسوڵمانەکەم بوو، دەستکەوتی (17) ساڵ و (20) ڕۆژی ژیانم لە سوپادا بریتی بوو لە عەبدوڕڕەحمان مەحمود دوری، لە سوپادا بووین بە برادەر و وەک یەک خێزان تێکەڵاویمان هەبوو، بە ڕاستی پیاوێکی زۆر موسوڵمان و زۆر ڕاست بوو، ئەم پیاوە کە ساڵی (2000) کۆچی دوایی کرد، ئەوەندەی چاکەی لەسەر منە، بڕوا ناکەم هیچ کەسێکم لەم جیهانەدا ئەوەندە چاکەی لەگەڵ کردبم.
سێ ساڵ لە قاهیرە ئەمخوێند، ئەم پیاوە لەو ماوەدا هەموو ساڵیک پێنج فەردە برنجی لە (شامیە) کە هەر فەردەیەکیان سەد کیلۆ بوو، کڕیویەتی و هێناویەتی بۆ ماڵومناڵی من، هەر بەو پێیە ڕۆن و شەکر و چا و تایتی بۆ کڕیبوون، هەمووی لە دەفتەرێکدا نووسیوە، پاش (3) ساڵەکە کە هاتمەوە، بە قیست پارەکەی وەرگرتەوە.
لێرەدا ئەمەوێت ئەو ڕاستییەی لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، بڵێم، کە خوای گەورە ڕێزی لە نەوەی ئادەم گرتووە بەگشتی، بەو مانایەی مەرج نییە ڕەوشت و ئاکار و هەڵسوکەوتی جوان تەنیا لە کەسی موسوڵماندا هەبێت، بۆیە دەبێت لەوە بە باشی تێبگەین ئەخلاق شتێکە بە هەموو مرۆڤێک دراوە، ئەوەشمان لە یاد نەچێت وەک ئیمامی عەلی (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: با کردەوەی تاک بەپێی ئایین هەڵبسەنگێنین، نەک ئایین بەپێی کردەوەی ئەو تاکەی بەناو پابەندە پێوەی.

## ٦
## نرخی کات لە ژیاندا

گرنگترین شتێک کە مرۆڤ دەسەڵاتی بەسەریدا هەبێت، بریتییە لە کات، پێشینان وتوویانە: (الوقت کالسیف ان لم تقطعه یقطعک)، واتە: کات وەک شمشێرێکی تیژە، ئەگەر تۆ نەیبڕی ئەو تۆ دەبڕێت.
لە کاتی خوێندنەکەمدا لەسەر ئەم بنچینەیە بناغەی ژیانم دانا، لە ماوەی ئەو چوار ساڵەدا لە کۆلێجی یاسا بووم و ئیمامیش بووم لە سوپا کە بە پلەی ئەفسەر دادەنرێت. هەموو ڕۆژێک لە کاتژمێر حەوتی بەیانییەوە تا دووی پاش نیوەڕۆ لە فەرمانگە بووم، ئیشوکاری فەرمانگەم تەواو دەکرد و لە پاشاندا دەچوومە شوێنێکی کەنار کە

کەس نەمبینێت، ئەو وانانەی کە ڕۆژی پێشوو خوێندبووم، بە مانا لەبەرم دەکرد، نەک بە (عبارة الفاظ)، چونکە شت لەبەرکردن بە مانا باشتر مرۆڤ لە بابەتەکە دەگات و درەنگتریش لە بیری دەچێتەوە، هەر بەم جۆرە خۆم فێر کرد کە بیروباوەڕی یاسایی تێبگەم، نەک خۆم فێری کتێبی مامۆستاکان بکەم، چونکە ئەگەر لەسەر کتێب بڕۆم، خوێندنەکەی کۆلێجم هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ خوێندنی حوجرە نابێت، بەدرێژایی ساڵ دەبێت هەر فێری کتێب ببم و دووربم لە ڕاست و چەوتیی ئەم کتێبانەوە، بیروباوەڕم وابێت کە هەرچی نووسراوە هەمووی ڕاستە، باوەڕم بە خۆم نەبێت کە منیش بیروباوەڕێکی تایبەتیم هەبێت لەم بابەتەدا.

هەرچیم دەخوێندەوە لە کتێبەکانی یاسا، لە هەموو جۆرە بابەتێک، پێشەکی لە دڵی خۆمدا بڕیارم دەدا کە ئەمە ڕاست نییە، ئینجا دوایی دەستم دەکرد بە لێکۆڵینەوەی، تا چاک و خراپەی بکەوێتە بەرچاوم بۆ ئەوەی چاکەکەی بگرم و خراپەکەی لە خۆم دوور بخەمەوە، ئەم جۆرە کردەوەیەشم لە فەرموودەی ئیمامی غەزالی (خوا لێی خۆشبێت) وەرگرت کە دەفەرمووێت: "من لم یشک لم ینظر ومن لم ینظر لم یبصر ومن لم یبصر بقی في العمی والظلال"، واتە: هەر کەسێک نەکەوێتە گومانەوە لە شتێکدا، بە قووڵی تەماشای ئەو شتە ناکات، ئەگەر بەم جۆرە تەماشای نەکرد، ڕاستییەکە ناکەوێتە ناو مێشکیەوە، ئەگەر نەگا بەم ڕاستییە، هەر بە کوێری و سەرلێشێواوی دەمێنێتەوە.

جگە لە قورئانی پیرۆز و فەرمووده ڕاستەکانی پێغەمبەر (د. خ)، بۆ بوارەکانی تر ئەم فەرموودەیەی غەزالی لە هەموو شتێکدا بەکار دەهێنم کە بمەوێت لێی تێبگەم.

هەر شتێک بخوێنمەوە یان ببینم، پێشەکی تەماشای وتەکە دەکەم، تەماشای خاوەنەکەی ناکەم، بەپێی فەرموودەی پێشینان وتوویانە: (انظر الی ما قیل ولا تنظر الی من قال)، واتە: تەماشای وتراوەکە بکە و تەماشای خاوەنی وتەکە مەکە، تاوەکو پێشەکی خۆت نەبەستیتەوە بەو وتەیەوە ڕاست بێت یان چەوت بێت، هەروەک ئێستا لە نێوان مامۆستاکانی ئایینی ئیسلامدا باوە، کاتێک گفتوگۆی لەگەڵ دەکەیت لە بابەت هەر شتێکەوە، پێشەکی پێت دەڵێت فلان زانا یان فلان مەزهەب وای فەرمووە، ئەمەش گەورەترین هۆی دواکەوتنی نەتەوە موسوڵمانەکانە لە ژیانی ئەم جیهانەدا.